# گەنجینەی فەرهەنگ و زانین

یا

# قسەی بێژاوەری و یێژراوەری پاراوی زمانی کوردی

نوسراوی: محەمەد صاڵح ئیبراهیمی (شەپۆل)

# سەرەتا

زۆر لەمێژبو لەوە دەگەرام هەلێکم بۆهەلکەوێ، دەمێک لێرەو لەوێ بەپێی تواناو بەش بەحالێ خۆم بانیوەو نیوە چلێش بێبناخەو هێمێکی توندی دڵ پەسەند بۆ دارشتنی، ئەو ئارەزووەی وا لەدڵما ببوەگرێو هەر ئاخو داخو خۆزیاو بریامبو، دیارە وتنی ئەوانەش مالی کەسی ئاوەدان نەکردۆتەوە، پیاوی پیاو دەبێ بەهۆی باهۆی دەسو بازۆڵەی خۆی تێکەوێو لەرێگای بەدی هێنانی ئاواتو نیازو ئارەزویدا قەت نەسروێ، بەدڵ پتەوێو چاکی پیاوانە ی لێ بکا بەلاداو بەزەبری مەچەکی لینەوینو لێبران: ملیدێوەلۆکەی بێ هەویایی باداوگێژەلۆکەی دەستەوستانیو بێ دەرەتانی لە بەر دارنێو کۆسپو لەمپەرو بەرگرو بەرهەلستان لەسەر رێگا لادا، تۆکە سالەهای سالە بەکوردی وتار دەنوسیو لەچاپەمەنیو رادیو بەدەنگی خۆت بلاوی دەکەیتەوە، بۆئەوەی بەبانەیێو بەبا نەروا، بەپێ توانا کارێک بکەو بۆئەو دەردە چارێک بدۆزەوە، هەستە. هەتا ماوێو لەبەرچاوێو ماوەت هەیە دەس بەکاربە، خۆت لەوخەمە رزگاربکە، ئەو قسەو وتارانەت کۆبکەوە با ئەگەر مردیو لە بیریش بچییەوە. با ئەوکارەی کە دەیکەی لەمەر مێژووەوە، کەس بەهیچی نەگرێ. با لەلای نوسەرانی دوارۆژی کوردەواری نرخێکی پێ نەدرێ، باپەیوینو نوسینەکانت کالو کرچیش بن، با دیرو پیتەکانیشت هەلقرچاوو بێنمودو پر لە لۆچو چرچیش بن، هەر ئەوەندە بۆ تۆ زۆرە کە کوردیەکەی ئەمرۆ دەخەیتە سەرکاغەزو بە شێک لە زوانە جوانو شیرینەکەت لە پارێزی دزو چەتەی داگیرکەر دەپارێزیو هەر چۆنێک بێت لەسوچێکەوە کە لێنێکی پێ پر دەبێتەوەو بەبەکجاری ناپوچێتەوە.

لەوانەیە، نوسەرانی باشی دەس‌و قەلەم جوانی کوردی لە مەوپاش کە ئەم نوسراوەی تۆدەبینن بزەیان بەکوڵەواری تۆبی‌و بەزەیان بەنەداری‌و هەژاری ئاسەواری کوردەواریدا بێتەوەو لەسۆینگەی تۆوە ئارەزوی نوسینیان بکرێتەوەو بۆ ئەوە دەری بخەن کە دەتوانن زۆر لەتۆچاکتر ئەو ئەرکە پێک بینن: شان بدەنە بەرو سەرو بەرێکی‌وا بەنوسین‌و ئاخەفتنمان بدەن کە بەشانازیەوە خۆ بنوێنن‌و لە باتی ئەم چەن مۆرە خوارو بۆرە کۆشک‌و تەلاری جوان‌و لەبارو سپی‌کار ساز بدەن، تۆ رچە بشکێنە جاباراوی پلینگ‌و شکاری شێران کاری چابوک سواران بێ. خوای گەورەش فەرمویەتی: لاَ يُكَلِّفُ اللهُ نَفْساً الاّ وُسْعَهَا: خواله توانا بەدر ناخاتە سەرکەس. پێشینانی کوردیش فەرمویانە: سمۆرە کوتی: لە دار کەوتمە خواری دومەنم کەم کرد، پرسیان: تۆ خۆت نیومەن نابی، ئەو دومەنەت لە کوێ هێنا؟ وتی: کاکی خۆم هەرکەس بەمەنی خۆی، جا ئەوە بو خۆم لێ خوش کردو بریارم‌دا کە لەسەر بۆریای خۆزیاو بریا لاچم‌و بەرانبەر بەوزەو توانای خۆم دەکش ئەوکارە دژوارە راچم، لەپرا خوا بۆی رەخساندم لەگەڵ حروف چینێکدا ناسیاو بوم‌و منیش کاغەزە با بردەڵە کانم کۆکردەوەو ئەویش بەم جوانی‌و لەباریە بۆی ئامادە کردم‌و لەو کۆسپە رزگاری کردم‌و لەو دەردە گرانەش چاری کردم. هیوا دارم لە بەر چاوی خۆینەرانیش شۆخ‌و شەنگ‌و نازدار بنوێنی‌و ئیتر بەزمانی نامۆ نەنوسین‌و خەڵک بەزمانی خۆمان فێر بکەین، دیارە هەرکەسێک وەک مامر هێلکەی مراوی هەڵینی‌و بەزمانی نامۆشت بنوسی‌و خەڵک تێ بگەیێنی هەر درانی پی دەمینی هەر وەک حاجی قادری رەحمەتی‌و نیشتمان ویست نوسەران‌و خۆیندەوارانی کورد، بە خەبەر دێنی‌و دەفەرمی: —

شیعر:

وەک مریشکێک کە بەختی نەهێنێ

بێتو جوجکەی مراوی هەڵێنێ

هەر بگاتە کە ناری جۆگەلەیەک

نایەتە شوێنی، بمرێ جوجەڵەیەک

ئەم لەوشکانی ئەو لەناو ئاوە

تێدەگا... درانی پێماوە.

سەرنج راکیشە لەکەژی بەهاری‌ساڵی ۱۳۲۶ی هەتاویدا رۆژێکیان بۆ دسنوێژ گرتن چومە سەر چۆمەڵە ئاوی بەردێ تەماشام کردمریشکێک هەر باڵەتەپەو قیرەقیرو قرتەقرتیەتی، وەک شێتو هار خۆی لە چۆمەڵە ئاوەکە نێزیک دەکردەوەو دەیقیراندو باڵەکانی لێکدەدا، لە سەرەتاوە وامزانی مار یاجرو جانەوەری تر توشی بوەو جوجەڵە کانی خواردوە، کەچی کاتێ نێزیک بومەوە ئەروانم وا جوجەڵەکانی لەنێو چۆمەڵە ئاوەکەدانو خەریکی کایەو مەلین ئەویش ناتوانێ برواتە نێو ئاوەکەو بۆ جوچکەکانی ئاگری گرتوەو نازانێ چبکا؟ هۆی ئەم کارە ئەوەیە کە لە باتی هێلکەی خۆی هێلکە مراوی هەڵێناوە، ئەم لەوشکانیو ئەو لە نێو ئاوە، ئیتر هەزاران ئافەرینم بۆ رۆحی پاکی حاجی قادر نارد

محەمەد صالح ئیبراهیمی محەمەدی (شەپۆل)

۱۳۷۱/۱/۱۰ی تاران هەتاوی.

بِسمِ اللّهِ الّرحمٰنِ الرّحیم

سەرنـــامەێی نـــامە نـــامی اللّـــە بـــێ نـــامی تـــە، نـــاتەمامە وَاللّـــە

# زوان لە ڕوانگای قورئانە وە

**اَلَمْ نَجْعَلْ لَهُ عَيْنَيْنِ وَلِسَاناً وَ شَفَتَيْنِ.**

ئایا دو چاو ویەک زوان و دو لیومان بە ئینسـان نـەداوە نـەخشی زوان لە ژیـانی بەرەی مرۆڤدا سە بارە ت بە زوان کە ئە ندامێکی گرینگی ئینسانە لە دوبارە وەبۆ قسـە لێکردن ئەبێ.

١ـ نەخشی زمان لە ژیانی مادی و مەعنەوی ئینساندا

٢ـ بەر پرسیار بونی زوان لە ژیانی ئینسانیدا لە ڕوانگای ئیسلامەوە ئێستا هەر دو بەشەکەی بە جۆرێکی کورت و پڕ واتا و بە کاکڵ دە هێنێنە گۆڕێ و قسەی لێوە ئەکەین.

**زوان:** پرتکە گوشتێکی ماهیچە یە، کە یەکەم کەرەستەیە بۆ قسە کردن وەیەکـەم

هۆیە بۆ خواردەمەنی، قوت دادن و چەشتنی خۆراک.

بە وێنەی هێلکە هەڵکەوتوە، لە بنەوە بە دوای کەفی دەم‌وە بە ئێسکی لامی‌یەوە، نوساه، یەک سەتحی بەرەوژور وە یەک سەتحی بەرەو ژێری هەیە و دولای ئەم لاولایەو یەک نوکی هەیە، فیزیۆلۆژی زمان لە جوینی خۆراک و قوت دانی خواردەمەنی و هەست کردنی تام و مەزەی خۆراک وە لە قسە کردن، دا ئەکوژێ. لە گەڵ ئەوەی وا زوان وەکوچا وبگوی، یەکێک لەکەرەستەی ناسین و زانینە و مرۆڤ ئەتوانێ لە ڕێگای زوانەوە چوار جۆر تامِ و مەز ەی خواردەمەنی بزانێ وەکو شیرنایی، تاڵی، سوێری و ترشی هەست بکات.

بە لأم قورئان لە ناو ئەوانەدا، تەنیا لە سەر نەخشی قسە پێکرد ەنەکەی دو پاتەی کردۆتەوە، وەلەم گۆشەوە بۆ زوان ئەڕوانێ و بەس، ئێمەش هەر لەم بابەتەوە زوان ئەدەینە بەرجەنجەری قسەو لێکۆڵینەوە و نوکتەش هەر لەمە دایە، ئەم بەشە لە هونەر نیشان دانی زوان، ئەونە گرینگە کە ئەرک و ئەسپارد ەکانی تری شاردوەتەوە، جەرباند ن سەلماندویەتی کە زۆربەی ئەوکەسانەی وا ناتوانن قسە بکەن نایش توانن ببیسن واتا: (منالی کەڕ لاڵیشە).

ئێمە ئێستا قسە لەم شتە عیلمی یە ناکەین منالێک بێنینە بەر چاو کە هەندێ گەورە بوبێ، بەلأم نەتوانێ قسە بکات ئایا ئەو جۆرە منالە ئەتوانێ شەخسییەت وەکە سایەتیەک کە بۆ منالأنی هاوتای هەیە ئەویش بە دەستی بهێنێ؟ دیارە ناتوانێ.

مرۆڤ لە ڕیگای قسە کردن و وت‌و وێژ و بیستنەوە، پرسین و وەلأم دانەوە لە شت‌تێ ئەگا و بە قوڵ و بینی کەسایەتی خۆی زیاد ئەکات، فێر کردن و بار هێنان کە پێگەیشتن و سەر کەوتنی ئینسان پێوەندی بەوە، لە ڕیگای فێر کرد نەوە دێتە دی و تەنیا زوانە کە ئەوکارە ی بە ئە ستۆ گرتووە.

مرۆڤێک بگرنە بەر چاو کە بە درێژایی تەمەنی زانست و هونەر فێر بوبێ و بۆ خۆی و کۆمەڵگای تێکوشا بێ لە ناکاو، پسک یالاڵ بێ وە قەڵەم و نوسین کە کارێکی سەختیشە، نەگاتە فریای، دیارە لە هەمو شوێنێکیش مرۆڤ ناتوانێ کەڵکی لێوەر بگرێ ئاوەها مرۆڤێک لەگەڵ بوزە پیاونکا، وەک یەک وا ئەبێ، مێشک و بیرو ئەندێشەی ئینسان

گەنجینەیەکە سەر بەخۆ و دەر بەستە و درگا لە سەر داخراو، کە تەنیا کلیلی ئەوە زوانە، تا بە و کلیلە درگای ئەو گەنجە نەکرێتەوە پلە و پایەی ئینسان ڕوناک نابێتەوە.
ئەوەیە وتراوە، کە سایەتی ئینسان لە ژێر زمانیدا شار دراوە تەوە، ئەوە زوا نەبۆتە، نیشانە بۆ خوا، هۆی پێگەیشتنی مرۆڤانی بەیان کارەوەی بیرو ئەندێشەی ئینسان و هەڵ سەنگاندنی شەخسییەت و کەسایەتی ئینسانە.

## باری زوان لە قورئانا:

لە بەر ئەمەیە کە قورئان دوای وەبیر هێنانەوەی ئافرینشی ئینسان فێر بونی زوان ئەهێنێتەوە بیرو یاد وەک ئەمە، گەورەترین نۆینگەی لوتف و میهرەوانی خوا سەبارەت بە مرۆف ئەمەیە، کە ئەم نیعمەتەی بەو بەخشیوە هەر وەکو خوا لە (سورەی الرحمٰنْ) ئایەتی ١-٣ فەرمویەتی (الرَّحْمٰنُ عَلَّمَ الْقُرآنَ خَلَقَ الإِنْسانَ عَلَّمَهُ الْبَيانْ) واتا: خوای بەخشەر کە بە ڕەسولی خۆی قورئانی فێر کرد، مرۆڤی خولقاندو بەیان و قسە کردنی فێری ئەو کرد ئەمە تەنیا شوێنیک نییە کە قورئان قسەی لەم نیعمەتەوە کردبێ بەڵکو ئەم واژە بیستو پێنج جار لە قورئانا بە وێنەی کۆ و تاک قسەی لێوە کراوە و هاتۆتە گۆڕ خوا لە قورئانا سورەی بەلەد ئایەتی ١-٣ دیاردە و ئاماژە بۆ گرینگ بونی زوان ئەکات و فەرمویەتی:
(اَلَمْ نَجْعَلْ لَهُ عَيْنَينِ وَ لِسا نًا وَ شَفَتَيْنِ).
ئایا بەومان دو چاو و یەک زوان نەداوە. قورئان لە ئاماژە کردن بەمە کە زوان کلیلە و ها چەری شەخسییەت و کەسایەتی ئینسانە ڕستەیەک لە پاتشای میسرەوە ئەگێڕێتەوە و ئەفەرمێ: (فَلَمّا كَلَّمَهُ قالَ اِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنا مَكِينٌ اَمِينٌ) سورەی یوسف ئایەتی ٥٤ کاتێ: لە گەڵ یوسفدا قسەی کرد ئەوسا بەوی گوت: تۆ ئەمرۆ لای ئێمە بارێ باش و پلەیێ تایبەتت بۆ هەیە و ئەمینی دارایی و سامانی. کاتێ یوسف خەون دیتنی پاتشای بە وێنەیەکی فێر دەرو ئامۆژگاری دەر لێک دایەوەو شێوەی ڕاگرتنی دانە وێڵەی وڵاتی بە وێنەیەکی تەبیعی بێ ساز دانی سیلو و عەمباری دەسکرد و پڕ خەرج بەوان فێر کرد و پەردەی لە سەر خەیانەتی ژنی: (عەزیزی میسر) و پاک داوێنی خۆی لاداو لەم ڕیگا یە شەوە، کەسایەتی و

شەخسییەتی مەزن بونی خۆی ئاشکرا کرد، لەم سۆنگەیەوە بو کە پاشا ئەونەی ڕێز لێناو ئەو پلەو پایەی پێداو کردی یە، گەنجینەوانی درایی وزێر و دراوی میسر. تا یوسف قسەی نەکرد بو کەسایەتی و پیاوەتی، شیاوی، ئەو لە پشت پەردەی ڕەشی نەناسیاوی دا لە گۆشەی زیندان‌دا دەروازەی لە سەر داخرابو، هەر لەم بارو بابەتەوەیە، کە سەعدی شیرازی لُر فەرمویەتی:

زبان در دهان ای خردمند چیست　　کلید درِ گنج صاحب هنر
چو در بسته باشد چه داند کسی　　که گوهر فروش است یا پیله‌ور

زانایان وُتویانە: زوان نیویێ لەکەسایەتی مرۆڤ پێک دینیێ، شاعیر گوتەنی:

لِسانُ الْفَتىٰ نِصْف وَ نِصْفُ فُؤادِه　　فَلَمْ يَبْقَ اِلاّ صُورَةُ اَلْلحمِ وَالْدمِ

زوانی یەک مرۆڤی جوامێر نیویێ لەکەسایەتی ئەوە نیوەکەی تریشی ئەقلّ و ناوەزی ئەوە، دیارە بێجگە لەوانە ئیتر گۆشتە و خوێنەو ئێسقانە.

لە پەندو ئەمسالی عەرەب دایە: (اَلْمَرء بِاَصْغَرَيهِ: قَلْبِهِ و لِسانِهِ).

نیشانەی مروڤ دلْ و زوانە　　ئەوانیَ تر بۆ سوان یا پووانە

مرۆڤ بە دو شتی چکۆلە یەوە دیارە و ناسیاوە:
یەکیان دلەو ئەوی تریان زوانە.

نەخش و ئەسپاردە و ئەرکی زوان ئەونە گرینگ و دیارە تەنانە ت حەزرتی موسا پێغەمبەر لە بەر خوا پاراوەتەوە کە لە کاتی قسە کردنا زوانی پە پت نەکا و زوانی نەگریێ هەر وەکو خوا لە سورەی تاها ئایەتی ٢٧ و ٢٨ دافەرمویە تی: (وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِنْ لِسَانِي يَفْقَهُوا قَوْلِي) واتا: خودایا گرێی زوانم بکەرەوە تا جوان لە قسەم بگەن.

موسا پێغەمبەر بەمە بەسی نەکرد بەڵکو لە بەر خودا باڕاوەتەوە، تا هارونی برای کە لەو زوان تەرو پاراوتر بووە لە گەڵ ئەوا بینێریێ تا لە کارو باری پێغەمبەرایەتی دا یارمەتی ئەو بدات. هەر وەکو خوا لە قورئانا لە سورەی قصص ئایەتی ٣٤) دا فەرمویەتی: (وَأَخِي هَارُونَ هُوَ أَفْصَحُ مِنِي لِسانًا فَأَرْسِلْهُ مَعِيَ رِدْئًا) واتا: هارونی برام کە لە من زبان تەرو پاراوترە بە ناوی یارمەتی دەرو یاوەر لە گەڵ منا بی‌نێرە، وە لە سورەی شوعەرا ئایەتی ١٣ خوا فەرمویەتی:

**(وَيَضيقُ صَدْرِي وَلاٰ يَنْطَلِقُ لِساني فَأَرْسِلْ اِلىٰ هٰارونَ)** واتا: سینگم تەنگ ئەبیٚ و ئەگیریٚ و زوانم رەوان نابیٚ (تکایە) بینێرە لای هارونیش.

دیارە کاری گرینگ و گەورەی پێغەمبەران بۆجیٚ بە جیٚ کردنی فەرمانی خـوا لە سۆنگەی زوانەوە، سە قام ئەگریٚ و ئەبریٚ بە رێوە، جا هەر لە بەر ئەمەیە کە خوا موژدەی بە پێغەمبەری مەزنی ئیسلام داوەو فەرمویەتی: ئێمە پەیامی خۆمان لە سەر زارو زوانی تۆ ئاسان و رەوان کردوە تا لە رێگای زوانەوە بەوانەی وا خودان تەوان و خۆ ئەپارێزن موژدە بدا و هۆزو قەومی کەللە رەقی پیٚ پترسێنی، هەر وەکو خوا لە (سورەی مەریەم ئایەتی ٩٧) دا فەرمویەتی:

**فَاِنَّما يَسَّرْناٰهُ بِلِسانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ الْمُتَّقينَ وَ تُنْذِرَبِهِ قوماً لُدّا).**

پێغەمبەرانی خوا هەمیشە لە خوایان ویستووە کە ژیانی ئەوان لە ناو بەرەی مرۆڤدا جۆرێک بێت تا لە سەر دەمی ژیان و دوای ژیانیشیان خەڵک بەمواستی و چاکی ناویان بەن و قسەی چاکە بنێنە پار سەنگیان، هەر وەکو حـەزرەتی ئـیبراهـیم ئـەمەی لە خـوا ویستووە، هەر وەکو خوا لە سورەی (شوعەرا ئایەتی ٨٤) دا فەرمویەتی: **(وَاجْعَلْ لِـي لِسانَ صِدْقٍ فِي الآخَرِينَ)** واتا: کاریٚ وا بکە خەڵک چاکەم بڵێن و بە چاکە و راست ناوم بهێنن.

لە ئایەتێکی دیکە دا لە بابەت ئاوە هاویستێکە وە لە بارەی حەزرەتی: (ئیسحاق و یەعقوب) ەوە،دەری بریوە هەر وەکو لە (سورەی مەریەم ئایەتی ٥٠) دا فەرمویەتی: **(وَ وَهَبْنا لَهُمْ مِنْ رَحْمَتِنا وَجَعَلْنا لَهُمْ لِسانَ صِدقٍ عليا)** واتا: ئەوانمان خـستە بـەر رەحـمەتی خۆمان و ناوی ئەوانمان بە چاکە و بە بەرزو بڵێندی لە ناو خە ڵکدا برە و پێدا.

قورئان تەنانەت لە بابەت جیا، جیا بونی زوانی خەڵکیشەوە قسەی کردوە و ئەم جیاوازی بونەشی بە نیشانەگەل و ئایەتی خۆی داناوە، دیارە بۆ بەر زو بڵێندی ئەم ئایەتە ئەمە بەسە کە خوا ئەوەی لە تەنیشت و کەناری ئافەرینشی ئاسمان و زەوی داناوە کە بە داخەوە تا ئێستاش هێمان ماک و ریشەی ئەم جیا جیـا بـونەی زوانـی هـۆز و نـەتەوە، نەتەوەی بەرەی مرۆڤ بۆ کەس روناک نەبۆتەوە و بۆ کەسیش دەرنەکەوتووە، ئەمەیە کە خوا فەرمویەتی:

وَ مِنْ آياتِهِ خَلْقُ السَّمواتِ وَ الأَرْضِ وَ اِخْتِلافُ اَلْسِنَتِكُمْ وَ اَلْوانِكُمْ اِنَّ فِي ذالِكَ لَآياتٍ لِلْعالِمِيْنَ) (سورہ ی رۆم ئایەتی ٢٢ واتا: دروست کردنی ئاسمانگەل و زەوی و جیاواز بونی زمانەکانتان، وە رەنگەکانتان لە ئایەت و نیشانەگەلی خودان بۆ ئەوکەسانەی وا عالیم و زانان).

زمانی کوردی لە سایەی قورئانەوە ئەتوانیٚ ئازاد بێت هەندیٚ لە جامیعە ناسان: (کۆمەڵ ناسان) ئەڵێن: پێدا ویست و ئیحتیاجی ژیان، ئینسانی ناچار کرد کە لە سەر دو پیٚ بروات و دەستی بۆ پەیدا کردنی خواردە مەنی و بژیو، یا بۆ دەس کردنەوە،بخاتە کار پاشان وردە وردە بالاّی راست بۆتەوە و پەنجەی دەستە کانی باریک بون و زنجیرەی ئەعساب و دەمارەکانی تێکەوە پێچران، لە نەتیجە دا توانی ئامرازو ئەسباب دروست کردن و کارە ژیانی‌یەکانی دیکە هەر لە هەوەڵەوە، ئەوی بۆ هاوکاری و ژیانی بە کۆمەل ناچار کرد، هاوکاریش ئەوی هانداکە هەوڵ بدات هۆیەک بۆ هاوچەشن کردنی کاری بە کۆمەڵ بدۆزێتەوە، لە نەتیجەی ئەمە دا زمانی‌بۆ پەیدا بو، لە پیشدا زمانی حەرەکی: (بزاوتنی) پاشان زمانی سەوتی: (دەنگی) ئەمەش دەیان هەزار ساڵی پیٚ چو تا شتێک لە چەشنی ئینسان پەیدا بو.

لە عیلمی ئینسان ناسی: (مرۆف ناسین) دا ئەڵێن: زمان هۆیەکی گرینگی دامەزراندنی پێوەندی یە لە ناو ئینسانەکان دا، زمان بەرو بوی ژیانی کۆمەلاّیەتی یە، لە هەر جێگا یەک کۆمەلاّنی ئینسان ژیاون زمانیش هەبووە لە مێژوی دوورو درێژی ئینسان دا، هیچ دەستە و کۆمەڵێکی ئینسان و ئەنزان نەبینراوە کە زمانی نەبو بێت، تەنیا پلەی پێگەیشتن چەشنی دەنگەکان، تێک خستنی و شەکان و ژمارەی واژەکان و شتی دیکەی وەک ئەمانە لە زمانەکاندا تەفاوەت و جیا وازی هەیە.

هێندێکانیش ئەڵێن: سیٚ عامیلی =١ـکار ٢ـبیر کرد نەوە. ٣ـزمان. بە هاوکاتی و لە سەر بنچینەی کار پەیدا بون و پێگەیشتن وە یەکیەتی‌یەکی وایان لە نێواندا هە یەکەشایانی جیابونەوە لەیەکتر نین لەم ناوەدا عامیلی کارهێم‌و بنچینەی ئەم تەرکیبەیە. وەکو ئەبینین ئەم بیرو رایانە هیچان یەکتر نەفی ناکەن و لە ئاخرین لێکۆلینەوە دا یەک ئەگرنەوە. بەلاّم لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا زمان تەنیا شتێکی کومەلاّیەتی و ئیجتماعی نییە، بەڵکو

موهەبەتێکی خودایی یە، لە قورئان دا هاتوە: (وَ عَلَّمَ آدَمَ الاَسْمٰاءَ کُلَّهٰا) سورەی بەقەرە ئایەتی ٣١ـ خودا هەمو ناوەکانی فێری ئادەم کرد.

سەبارەت بەوەکە بەشی ئەساسی و بناغەیی و بنەرەتی لە زمان ناوەکان، واتا: خودا ئادەمی فێری زمان کرد یا بە و تەیەکی دیکە بە زاراوەی عیلمی وەک (تَسْمیەی کُلّ) بە (اسمی جُزء) وایە، مەبەست لە ناوەکان کە جوزئێکن لە زمان کُلّ ـ ە کە یەکە زمانە یا وەک ئیمام فخری رازی ئەڵێ: توانای قسە کردن یانێ: زمان موهەبەتێکە لە خوداوە بە ئینسان دراوە.

دیارە زوان نەتەنیا هۆیەکی نیایشی خوا و زۆرێ لە واجبات وەکو نوێژ، وتنی شایە دیمان و بڕوا وتن و قسە کردن و وت و وێژ لە ڕێگای زوانەوە ئەنجام ئەدرێن.

خوا سەبارەت بە لوتفی خۆی بۆ حەزرەتی موسا کە گەیاندویەتە پلەی بەرزی کەلیمی و قسەی لەگەڵ موسا کردوەو ئەویشی وادار بە وەڵام دانەوە کردوە هەر وەکو خوا لە (سورەی نیساء ئایەتی ١۶۴) دا فەرمویەتی: وَکَلَّمَ اللّٰهُ مُوسَیٰ تَکْلیماً.

لە ئایەتێکی دیکەدا خوا قسە کردنی منالێک لە بێشکەدا بە ئایەت و نیشانەی خوا دا ئەنێ هەر وەکو لە (سورەی مائیدە ئایەتی ١١٠) دافەرمویەتی: (تُکَلِّمُ النّٰاسَ فِی الْمَهْدِ وَ کَهْلاً) واتا: لە لاندکدا و لە کاتی گەورە بون و پیریدا لە گەڵ خەڵک دا قسە ئەکات و دەئاخۆی.

پلە و پایە و بایەخی ئەم نیعمەتە کە زمانە هەمو کەس ئەی زانێ و پەی بە گرینگی زوان بردوە، زانایان و هوزانڤانان ئەونەیان بە بەڕن و باڵای زوانا هەڵ خوێندوە کە لەم وتارەدا ناگونجێ.

یەکێک لە بیرەوەران لەم بارەوە گوتویەتی: (زوانگە واهی دڵ و دەرونە و داوەری حەق و باتڵە، زوان راستی و دروستی شت دەر ئەخا و دەری ئەبڕێ. زوان پەند دەرێکە، خەڵک ئەگێرێتەوە لەگوناح کردن و دۆستی و مەحەبەت بەدی ئەهێنێ، زوان هۆی سپاس کردنە بۆ خوا و ئەبێتە هۆی زیاد بون و فرە بونی نیعمەت و شتانی تریش.

ئەو خزمەت و ڕاژە گەورەی وا زوانی قورئان و زمانی حەزرەتی محەمەد پێغەمبەری مەزنی ئیسلام بە کۆمەڵگای بەرەی مرۆڤی کردوە هیچ هێزو وزەیەک ئەنجامی

نەداوە و بۆی نەکراوە و بۆیی نەلواوە، بڕا بونی زوان لە بڕا بونی شیر تیژ ترو بڕاترە.

**(لِسانُ مُحَمَّدٍ امْضَىٰ غِزاراً = وَأَنْفَذَ مِن طبـاحدالحِسـام)** واتـا: زوانـی حـەزرەتی محەمەد (د ـ خ) تیژ ترو نافیزتر لە بڕندەگی و تیژی شیرە.

لە نەرم بونیشا لە حەریر نەرم ترە.

بـە شـیرین زوانـی و لوتـف و خـۆشی ئـەتوانـی کـێفیٚ بـە مـوێی بکـێشی

زمان لە زارا بۆ خۆی شتێکە، ئەم هۆیە پێک ئەهێنێ کە بەرەی مروڤ بە قسەکـردن لە تەک یەکتریدا لێک حاڵی بن مرۆگەل، کۆمەڵی بەرەی مرۆ لە ناو یەکدا پێکەوەپەیوەندی پەیدا بکەن و لە یەکتر نێزیک بنەوە بە مەرجێ کە زمان ئەم تیکە گۆشتە نەرمە بێ گرێ یە بە راستی پێی بدوێن، بە واتای قورئان: **(قُولُوا قَوْلاً سَدِيداً)** بۆ راسـتی و راسـت وێـژی بزوێ و بجوڵێتە وە.

چونکا هەر ئەم زمانە خۆی گەورەترین هـۆی پـەیوەندی ئینسـانە بۆئـاڵ و گـۆڕ کردنی بیرەوەری، لە ناو بەرەی مرۆدا بەفەمودەی سەعدی: زوان کلیلی گەنجەی خاوەن هونەرە کاتێ زوان کلیلی درگای گەنجەی سیفاتی بەرزی ئینسانی بێت، ئەی بوچی مرۆ لەم خەزینەی خودا دادی‌یە، لەڕێگای فێرکردن و بارهێنانی پایە و پلەی بەرزی ئینسانی، وەبۆپێشخستنی ئامانج گەلی بەرزی مرۆوایەتی بەکاری نەبەین؟ بـۆچ ئـەبێ لە ڕێگـای خێرو چاکەی بەرەی مرۆدا هەنگاو هەڵ نەگرین؟

بۆچ‌ئەبێ لەڕێگای پیاوەتی‌وبارمەتی‌وهاودەنگی‌و هاورەنگی، زمانمان نەگێرین، زمان شتێکە قسەی پێ‌ئەکرێ وەتەنیا شتێکە لەخێرو چاکەدا بەرەی‌مرۆ پێکەوە پەیوەند ئەدا،کە وابو لە هەر ڕێگاییکەوە کەبلوێ ئەبێ بۆ بەختەوەریو رەحەتی مرۆ بەکار بهێنرێ. زمان خۆی "کاشفی خۆناسینە" یەکێک لەزانایان، لەم بابەتەوە دەبێژی: "مرۆ لە ژێر قسەی زماناون ئەبی یـان‌دیاری‌ئەدا، کـورد ئـەڵێ: ئـەگـەر زمـان بـهێڵێ سـەر سـلامەتە، زمـان ناسێنەری شخصیتی مرۆیە، بزوتنەوەی ئەم لەتە گۆشتە کە زمانی ناوەچاکەو خـراپـەی ئینسـان دەرئەخات ئەگێزنەوە، کە ئەرەستو شاگـرد یٚکـی ئـەبێ‌و هـاوارئـەکـات کـوڕە! بۆدەمت هەڵنابچری بزانم، چت‌لەجانتادایە؟ دیارە عە یب‌و هونەری مرۆ لە قسەکـردنا دەر ئەکەوێ. خودا لەقورئانا لەسورەی محمدداص ئایەی ٣٠دائەفەرمێ: **(وَلَوْ نَشاءُ لأَرَيْنا**

لَهُمْ بِسيمئهُمْ وَلَتَعرِفَنَّهُمْ فِي لَحْنِ الْقَوْلِ وَاللّٰهُ يَعْلَمُ اَعْمالَهُمْ).

یانی: ناسینیپیاوچاکانوجیاکردنەویان، لەمونافیقان وپیاوخراپانبە لەحنی قسەیانە، بەواتایێ تربەقسەکردن ئەناسرین خودا لە قورئانا لە سورەی ابراهیم ئایەی ۲۴دا ئەفەرمێ: اَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ اللّٰهُ مَثَلاً كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ اَصْلُها ثابتٌ وَ فَرْعُها فِي السماءِ تُؤتِي اُكُلَها كُلَّ حِينٍ بِاِذنِ رَبِّها "یانی: ئایا نازانی چۆن خودا نەزیلە ئەهێنێتەوە و ئەفەرمێ قسەی چاکو پەسەندوراست وەک داری پاک وایە کە ریشەو رەگژی لە زەویدا شین بوبێ و رەگی داکوتابێ و شاخەو لقەکانیشی چوبێ بە ئاسمانا، وە بەئیزنوفەرمانی خودا هەرکات و زەمانێک بەر بەهێنێ و میوە بدا کەوا بو قسەی چاک و بەکەڵک پرسودو بەکەڵکە.

یان وەک ئەم ئایەتە کە خودا ئەفەرمێ: "قَوْلٌ مَعْرُوفٌ وَ مَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِنْ صَدَقَةٍ يَتْبَعُها اَذی".

یانی: قسەی چاکو خوشو گوزەشت کردن، زۆر لە صدقەییک باشترە کە بی کۆڵیتەوە وییدەیتەوە بەناو چاویدا وهەی دوپاتی کەیتەوە، لە قورئانا ئایەت لەم بابەتەوە فرەیە وەک ئەم ئایەتە: "قُلْ لَهُما قَوْلاً كَرِيماً..." خودا دستورئەدا: کە ئەبێ لەگەڵ داێک و باوکمانا قسەی نەرم و نیان بکەین پیاوانە بجوڵێنەوە، یان وەک ئەمە کە خودا بەحضرتی محمد ص دەستور ئەدا و ئەفەرمێ "...قُلْ لِعبادي يَقُولُ الَّتي هِيَ اَحْسَنُ..."

یانی: بەبەندەگانی من را بگەیینەتا قسەی باش و بەکەڵک بکەن، خودای مەزن لە شۆینێکی ترا لە قورئانا ئەفەرمێ "...اُدْعُ اِلی سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ والموعظه الحسنه..."

یانێ: لە رێگای حیکمەت و پە ندو ئەندەرزەوەبەرەی مرۆ بانگ بکە بۆ رێ خودای خوت یان وەک ئەم ئایەتە: «... و اذا قُلْتُم فَاَعْدِلُوا...» لە کاتی قسە کردنا عادلانە بدوێن ... بە واتایێ تر ئەگەر قسەی چاکت بۆنایێ لەقسەی زیاناوی وخراپ خۆت لادە هەروەک سَعْدِی دەیێژێ:

نگـاهدار زبـان تـا بـه دوزخت نـبرند — که در جهان بتر از این زبان گناهی نیست

ئێستە کە لە پلەو پایە و بایەخی زوان ئاگادار بوین، ئەبێ لە بابەت باری زوان، وە گرینگی بەر پرسیار بونی زوانیش ئاگادار بین، ئەمە بەسە کە بزانین کە بەم تیکە گۆشتە

گەورەترین خزمەت‌وراژە کردن وەمەزن‌ترین گوناح کردن و تاوان ئەنجام ئەدریٚ (نە قل لە: گرشەی کوردستان ژمارەی ۲ و ۳ نوسان (خاکە لیوەی) ۱۳۶۰ هە تاوی‌و ۱۹۸۱ زو ۲۵۹۳ کوردی لاپەرەی ۴ و ۵ چاپی تاران خاوەن ئیمتیاز و بە رپرسیار وسەر دە بیر محەمەد صالح ئیبراهمی (شە پۆل) کەیەکەم ژمارەی لە ۱۹۸۱/۳/۱ زاینی کە لەتاران تانوژمارەی لی بلاو کراوتەوە.)

## بەرپرسیاربونە قورسەکانی زمان:

**وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلإِنْسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيد مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلاَّ لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدْ.** سورەی ق ئایەتی ۱۶ـ۱۸) واتا: مرۆڤمان ئافەریدە کرد و لەوەسوەسە و ئەندێشەی دڵ و دەرونی ئەویش ئاگادارین وە لە رەگی بناگۆی بۆئەو نیزیکترین دو فرشتە و پەری (رَقیبٌ و عَتیِدْ) لە لای راستە و چەپەی بۆ چاو دێری ئەو دانیشتون، هەرقسە یەک لە خێر و شەر بە زوانا بهێنێ یا بیبا ئەو دو فرشتانە بۆ نوسینی ئامادەن‌و زو ئەی قۆزنەوە وەئەی نوسن.

قسە و لێکۆڵینەوەکەی بە رو، ئەخشی زوانی لەگەران وگۆریانی ژیانی ماددی و مە عنەوی ئینساندا زۆر بە روناکی بۆ ئێمەی درخست و ئاشکرای کرد وە پەردەی‌لە سەر نە ناساوی لادا و ئێمەی بە گرینگی ئەخش و رۆڵی زمان ناسیاو کرد، گرینگی و باری زوانمان لە هەر دو کەوشەنی ماددی و مەعنەوی دا بۆ دەرکەوت و بۆمان روناک هەڵکرا، بۆ گرینگی و مەزنی و پلە و پایەی زوان ئەمە بەسە کە کوفر و بروا لە ریگای شایەدی دانی زمانەوە ئەنجام ئەدرێ، لە پەرەدار بونی کەوشەن و سنوری بێ سنوری زوانا ئەمە بەسە کە چاو، تە نیا رەنگ ئەبینێ و دەرکی ئەکات، گوێ تەنیا مەوج و شەپۆلی دەنگ ئەبیسێ و دەس تەنیا بۆلای ئەجسام درێژ ئەبێ کەچی بۆکارو کردەوەی زوان سنور و کەوشە نێک لە کار دا نییە، زوان لە بابە تبون و نەبون: «مە وجود و مە عدوم) حەق و باتڵ دیار و نادیار، خێر و شەر باش‌و ناباش، چاک و ناچاک قسە ئەکات و ئەجولێ و ئەبزوێ لە کەوشەنی شەر دا؛ لەم بابەتەوە ئەگەر قەید و بەندێک بۆ ئەوە لە گۆرا نەبێ و هەوساری ژیان بدرێتە

دەس زوان، مرۆڤ توشی چارە نوسێکی خراپ و ڕۆژە ڕەشی ئەکات، کورد ئەڵێ:

١ـ ئەگەر زوان بێڵێ سەر سەلامەتە.

٢ـ مولە زوانی بڕویَ.

٣ـ زبان نە برِم سەرت، ئەبڕی سە رم.

٤ـ زوان، باز، قسیە لە دڵیا جێگە ناگرێ.

٥ـ زوانی لە تەک سەریا بازی ئەکا.

٦ـ زوانم بازو سەرم سەلامەت.

زانایانیش لەم بابەتەوە و تویانە: مرۆڤی خودان تەتقوا و خۆ پارێز کاتێ لە تەقوا و خۆپارێزی خۆی کەڵک وەر ئەگرێ کە وریای زوانی بێت.

کوردیش ئەڵێ: **قسە بیچێرە، دای بێژە، بی‌هاوێژە**، ئەم پرتکە گرشتە بە قسەیەک لە ناو کۆڕ و کۆمەڵێکدا ئاگرێک هەڵ ئەکات و بە بێژە یەک تۆمی خۆشەویستی ئەچەقێنێ و نا لە بارترین دژو دوژمن ئارام ئەکاتەوە بە واتایێ‌تر زوان بە هاتنە قسە کردن چارە نوس‌سازدەرە، با بەختەوەر هێنەرە. لەم بابەتەوە بوکە قورآن لە هەبونی دو فریشتەی (رقیب و عتید) کە لە زوان چاوەدێری ئەکەن قسەی کردوە، کە هەمو قسەو باسی مرۆف وەر ئەگرن و ئەی نوسن و لە ڕۆژی جەزا و سزا دا بەڵگە بۆ قسە کردن ناخاتە کار و زوان نابزۆێنێ، بەلام مرۆفی نازیر و کەم ئاوەز ئەقلی لە پشت زوان یەتی و هەمیشە بێ هەڵ سەکاندن دەس ئەکا بە قسە کردن و چە نە وێرغەیی خۆی نیشان ئەدا، قسەیَ هەڵیت و پلیت و کاڵ و نەکولیو و بێ کاکڵە، هەڵ ئەڕێژێ وەک ئاشی فرەهاڕوردیش ئە هارێ و درشتیش، جا لە دوایی دالەوێ کاوێ کە بیر ئەکاتەوە دەس ئەکا بەوەی من وەی من و ئەڵێ: وەرە بیبەستە بە نوکی زمانمەوە.

## تاوان و ئافەتی زمان

زانایان و هوزانڤانانی زانستی خو و ئاکار، بۆ زوان ئافەت و تاوانێ زۆر بەر فرەیان داناوەو وتویانە: هەمو شت بە زوانە، زوان تا تۆم جیرانی رەحەتیم نیە لە گیانی، ئیمام

**محەمەدی غەزالی** کە لە سالی ۴۵۰ زاینی لە تابران غەزال لە دایک بوە و لە سالی ۵۰۵ زاینی بارگەی بەرەو لای خواتێکناوە لە هەمو زانایانێک زیاتر زیان و تاوانی بۆ زوان داناوە و لە پەراوەی (احیاء العلوم ج ۳ پەرەی ۱۰۸ـ۱۶۳ چاپی بیروت دارالمعرفه) دا بیست ئافەت و تاوانی بۆ زوان ژماردوە هەندێ لەو ئافەت و تاوانانە لە قورآنا هاتووە، لە روانگای ئیام **محەمەدی غەزالی** یەوە گوناح کردن و تاوانی ئەندامانی تری بەرەی مرۆڤ بەرتەسکە واتا: وەکو تاوانکردنی زوان پەرەدار و زۆر نین.

لێرەوەیە ئەشێ بێژین ئەگەر زوان نە خشی گەوورە و شوێنێ بەزری لە ژین و ژیانی بەرەی مرۆڤ دا هەیە بەر پرسیار بونێ مەزنتر و قورسترێکیشی بە ئەستۆوە گرتووە، لێرەوەیە کە پێغەمبەری مەزنی ئیسلام فەرمویەتی: **(إنَّ أَكْثَرَ خَطَا يا ابْنُ آدَمَ في لِسانِهِ)** واتا: زوان ناوەند و سەرچاوەی زۆربەی خەتا و تاوان کردنی کورانی بابە ئادەمە، وا هەندێ لەو گوناح کردنانەی وا لە سۆنگەی زوانە وە ئەنجام ئەدرێ یەکە یەکە بۆ ئێوەی بەرێز ناویان ئەبەین.

**١ـ غەیبەت کردن** - یەکێک لە گوناحی کە بیرە؛ غەیبەت کردنە نەحس و ناشیاوی و حرام بونی غەیبە تکردن هەمو کەس ئەیزانێ کە چەندە ناشیرین و ناشیاو و ناپەسەندە ئەمەیە کە خواله قورآنا لە سورەی حوجوراتا لە ئایەتی ۱۲) دا فەرمویەتی: **(وَلا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضاً)** واتا: نابێ هەندێکتان، هەندێ ترتان غەیبەت بکا، دیارە ئەم تاوانە لە ریگای زوانەوە ئەنجان ئەدرێ واتا: بە زوان یەکسترین غەیبەت ئەکەن.

**٢ـ بیدعەت کردن** - واتا: شتێک بە شێک لە دین و ئاین نییە بە دانستە بی خزێنینە ناو ئاین و دینەوە، بۆ وێنە حەلاڵێک بە حەرام و یا حەرامێک بە حەلاڵ بناسێنین، گوێ نە دەینە فەرمانی خوا بەمەئەڵێن: بیدعەت یا بیدعەت کردن، خوا لە سورەی نحل ئایەتی ۱۱۶) دا لەم بابەتەوە فەرمەیەتی:

**( وَلا تَقُولُوا لِما تَصِفُ اَلْسِنَتُكُمُ الْكَذِبَ هٰذا حَرامٌ لِتَفْتَرُوا عَلَى اللهِ الْكَذِبَ)**. بە زوانی خۆتان پەسەندی درۆ مەکەن و مەڵێن: ئەمە حەلاڵە و ئەوەش حەرامە، نە وەکو بە زمانی خوداوە ئیفتیرا بکەن.

**٣ـ نیفاق** - واتا: دورۆیی، یەکێکە لەو نەخۆشیانەی کوشەندەی کۆمەڵگا و

کۆمەڵ، نیفاق ئەمەیە، کە قسەی مرۆڤ لەگەڵ ئەوەی وا لە ناخی دڵ و دەرونیدایە یەک نەبن و یەک نەگرنەوە، خوا لە: (سورەی فەتح ئایەتی ١١) دالەم بابەتەوە فەرمویەتی:

(**يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِمْ مَالَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ**) واتا: بە زوان شتێک ئەڵێن و قسە لە شتێ ئەکەن کە لە دڵ و دەرونیاندا ئەوە نییە، وەلە ئایەتێکی ترا فەرمویەتی: (**إِذْ تَلَقَّوْنَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُمْ مَالَيْسَ لَكُمْ بِهِ عِلْمٌ**) سورە نور ئایەتی ١٥) واتا: لەو کارەی وا بە زوانتان فێری ئەوە (**اِفْكْ**) ئەبون بە سەر زارەکی شتێک ئەڵێن: کە زانست و یەقینیان بەوە نییە.

**٤ـ کە تمانی شەهادەت** - شایەدی دان لەو مەبەستانەی وا پێوەندی بە مافی بەرەی مرۆفەوە هەیە وا جبە، دیارە ئەمە ئەرک و ئەسپاردەی زمانە، کە ئەبێ بیڵێ و نەی شارێتەوە. قورآن لەم بابەتەوە فەرمویەتی: (**وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ...**) سورەی بەقرە ئایەتی ٢٨٣) واتا: هەرگیز شایەدی خۆتان لە بارەی ئینسانە وە، مەشارنەوە و کەتمانی مەکەن.

**٥ـ مەسخەرە کردن** - واتا: ئیستهزا و مەسخەرە کردنی تاکەتاکی خودان ئیمان کە شۆخی کردن بە ئابڕوی ئەوانە لە دینی پاک و بێخەوشی ئیسلاما حەرامە و مەنع کراوە قورئان لەم بابەتەوە فەرمویەتی:

(**لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَىٰ أَنْ يَكُونُوا خَيْرًا مِنْهُمْ**) سورەی حوجورات ئایەتی ١١) واتا: هەرگیز نابێ تاقمێ تاقمی‌تر مەسخەرە بکا بەڵکو لەوان باشتربن.

بە واتایی‌تر نابێ هیچ تاقمێک هیچ تاقمێکی‌تر مەسخە رە بکات، چونکا ئەگونجی‌ئەوانەی وا مەسخەرە کراون لە وانەی وا مەسخە رە ئەکەن چاکتر و باشتر بن.

**٦ـ بە لێنی بە درۆ** - بەلێنی بە درۆ نیشانەی بێ شەخسیەتی ئینسانە، خوا لە بابەت حەزرەتی سمایل پێغەمبەرەوە فەرمویەتی: (**إِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولًا نَبِيًّا**). سورەی مەریم ئایەتی ٥٤) ئەو لە بەڵێن دانی خۆیدا ڕاست بێژو لە ڕەسولان و پێغەمبەران بو.

**٧ـ درۆ بێژی** - لە بابەت ناشیاوی و ناله باری و ناباشی درۆگوتن و ئەم تاوان و گناحەوە، ئایەت و ریوایەتێ زۆر هەیە بۆ وێنە خوا لە (سورەی نەحل ئایەتی ١٠٥) دافەمویەتی: (**إِنَّمَا يَفْتَرِي الْكَذِبَ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ**) واتا: ئەو جۆرە کەسانە درۆ ئەڵێن کە بڕوایان بە ئایەت و نیشانەکانی خوا نەیێت.

**٨ـ نه مامی یا قسه هێنان و بردن** - ئەوەی وا قسەی ئەم و ئەو بۆ یەکترین ئەگێڕنەوە، لە نێوان دۆ کەسا یا لە نێوان دو هۆزا ئاگری دژو دژمنایەتی خۆش ئەکا کە لە زاراوەی قورئانا بە (حَمَّالَةَ الْحَطَبْ) و لە کوردیدا «ئاگر هەڵایسێن» ناو دارە دارو چرپی و چیلکە هێنەرو ئاگر خۆشکەرە، خودا لە (سورەی قەلەم ئایەتی ١١( لە بابەت یەکێک لە مەئمورانەوە خۆ بە زل زانان فەرمویەتی: (هَمَّازٍ مَشَّآءٍ بِنَمِيمٍ) ئەمەیە کە هەمیشە لە قسە ئەگەرێ کە بە گۆی ئە م و ئەوی دابدا هەر لە هات و چۆ دایە، تا خەڵک پێکەوە بە گژ یەکترابدا.

**٩ـ رۆچونە ناو باتڵەوە** - مەبەست لەمە شەرحی کار و بارو حاڵی ژنان و مەی خوارد نەوە وگێرانەوەی چریکە و چرۆی بەدئامۆزە، کە هۆی مەحکوم بونی هەندێ کەس لە رۆژی قیامەتدا هەر ئەمە دا ئەنێ کە ئەفەرمێ: (وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ الْخَائِضِين) سورەی مدَّثِرْ ئایەتی ٤٥ واتا: ئێمە لەگەڵ ئەهلی باتڵا بە باتڵ قسەمان ئەکرد، قورئان موسوڵمانان لە بەشداری کردن لە کۆڕ و کۆمەڵگایەکی ئاوەها دا نەهی کردوە و فەرمویەتی: (فَلاَ تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ) سورەی نساء ئایەتی ١٣٩) واتا: هەرگیز لە گەڵ ئەوانەدا لە کۆڕو کۆمەڵگایەکدا بەشداری مەکەن و لە گەڵیانا دا مەنیشن تا لە و قسە باتڵانە ئەبنەوە.

**١٠ـ ئەوەی وابەدوی عەیب و عاری خەڵک ئەکەوێ** - ئەوانەی وا بە عەیب و عاری خەڵکەوەن و نێونیتکە لە خەڵک هەڵ ئەدە ن و ئەیانە وێ پەردەی ناموس ی خەڵک هەڵدڕن قورئان چارە نوسی شومی ئەوانەی دیار کردوە، هەر وەکو لە قورئانا لە سورەی هُمَزَه ئایەتی ١) دافەرمویەتی: (وَيْلٌ لِكُلِّ هُمَزَةٍ لُمَزَةٍ) واتا: وای بۆ ئەوانەی وا بە دوی عەیب و عاری خەڵک ئەکەون و نێو نیتکە لە خەڵک هەڵ ئەدەن و زوان شڕو دڕن.

تاوان و گوناحانێک کە لە سۆنگەی زوانەوە، ئەکرێ و ئەنجام ئە درێ لەم دە، دانەیە دا کورت نابێتەوە و داناکوژێ. بە ڵکو لەم بابەتە وە تاوان یا گوناحانێ تریش هەن کە لەرێگای زوانەوە ئەکرێن. لە قورئانا بە هەندێ لەم تاوانانە ئاماژە کراوەو لە فەرمودەی پێغەمبەری مەزنی ئیسلامیشدا زۆر جوان بە وردی و پەرە داڕانە گوناح و تاوانەکانی زمان دەر خراوە وەکو ئەمانە:

**١ـ خۆ بێ نیاز لە خوا زانین.**

**٢ـ جەنگ و جیدال.**

**٣ـ جوێن دان و دەم پیسی.**

**٤ـ دەر خستنی نهێنی خەڵک.**

**٥ـ لەعنەت کردن.**

**٦ـ پەسەندی بێجێ.**

**٧ـ زەمی بێجێ.**

**٨ـ گاڵتەو گەپێ زیاتر لە حەدّی شەرعی.**

**٩ـ قسەی بێ کەڵک و بێجێ کە لە زاراوەی زانایانی زانستی خو وئاکارا بە (مالا یە عنی) ناوە براوە.**

**١٠ـ قسەی کاڵ و نەکوڵیو بەقینەوە، قسە کردن بۆ زانینی باشتری تاوانەکانی زوان بڕوانە (احیاء العلوم ئیمام محەمەدی غەزالی ج ٣ پەرەی ١٠٨ـ١٦٢).**

**پێغەمبەری مەزنی ئیسلام فەرمویەتی: زوان جۆرێک سزا ئەدرێ کە هیچ ئەندامێکی لەشی بەرەی مرۆڤ وا سزا نادرێ، کاتێ زوان دەس ئەکا بە شکایەت بوچ وا سزا ئە درێم، پێی ئەوترێ تۆ قسەت کرد و قسەت گەیشتە خۆر هەڵات و خۆر ئاوالە سۆینگەی تۆوە چها خوێن رژا و مرۆڤ کوژرا، ئیتر پیێ ناوێ، سزای تۆ سوک ناوێ. پاک و خاوێن ڕاگرتنی زوان هۆی پتە و ڕاگرتنی دین و بڕوا و ئیمانە موسوڵمان ئەبێ زوانی بپارێزێ تا خوایش ئەو لە دەردو بەلاّ بپارێزێ.**

هیوا دارین جۆرێک بار بێن کە زوانمان پاک و چاک بێت و بە چاکە بگەرێ تا چاکمان بێتە رێ. نە قل لە کتێبی: ژیناوەری زانایانی کورد... یا گە نجینەی فەرهەنگ و زانست نوسراوی:(شە پۆل) لاپەڕەی ١ تا ٢٧ چاپی یەکەم گولآنی ١٣٦٤ هەتاوی چاپی تاران چاپخانەی مەهارەت.

***

# چاو لەڕوانگەی

# قورئان و زانینەوە

**اَلَمْ نَجْعَل لَهُ عَينين، ولساناً وشَفَتَيْنِ، و هَدَيْناهُ النَـجْدَينِ،** واتـا: ئـایا دو چـاومان بەمرۆف نە داوە، یا زمانێک و دولیومان پـێ عەتـانەکـردوە؟ بـەڵێ هـەم چـاوی بینـایی ورووناکی رۆژمان بە مرۆف داوە وهەم رێگای چاکە و خراپەمان نیشان داوە، جـائەگـەر ئینسان بەوچرانورانی‌یە، بـەرپـێ خـۆی نـەبینی و بکـەوێ، لێ بگـەڕێ بـاتێ کـە وێ و سەرنەکەوێ و لە قورچەقێ خوا لەنێو نیشانەکانی خۆیدا ئیشارە بەنیعمەتی چاو دەکا، چونکا، چاو گرینگترین هۆی پێوەندی ئینسـانە لەگەڵ دنیای خاریج دا، سـەیروسەمەرە کانی چاو ئەونە زۆرە، کە مـرۆف‌سەر سوڕمـان دەکـاو لەراست خـوای بـە رزوخـاوەن نیعمەت دا ملی پێ دا ئەنەوێ کە ئەونیعمتە گەورە و بەنرخە، کە چـاوە، بـە ئینسـانی داوە، ئەو حەوت چین و نهۆمانەی، کە لە چاودان و بەناوی (صلبیە یا قرنیە، مەشیمیە، عینەبیە، جەلدیە، زولالیە، زوجاجیە و شەبەکیە) ناودارن، بۆهەر یەکەیان، ساختمانێکی عەجیب و جوان وزەریف و عەجبات هـەیە، کـە قـانون و یـاسای فـیزیکی و شیمیـایی مەربوت بە نور و ئاوینە کان بەورد وپڕ لە ریزەکاری جـوان جـوان لەودا لەبـەرچـاو گیردراوەو دامەزراوە، بەجۆرێکی واپێشکەو توترین و تەیارترین دوربینی چاکی، وێنە

هەڵگری لە راست چاو دا، کەخوا بە مرۆڤی داوەهیچ وبێ بایەخە، کەچیئەم دەسکردەش خۆی زۆرپڕقیمەتە.

بە راستی ئەگەر لەتەواوی دنیادا تەنیا ئینسان و لەتەواوی لەشی ئینسانیشدا خوا تەنیا چاوی عەتاکرد با بۆناسینی زانست و هێزو عەزەمەتی پەروەردگار، بەس بو.

بەلاّم زمان گرنیگترین هۆی پێوەندی ئینسانە لەگەڵ ئینسانێ دیکەدا، بۆگورینەوەی بیروراو ئەندێشەو ئاگاداربون، بۆبەدەس هێنانی ئاشنایی و ناسیاوی کەسێ لەگەڵ کەسێ تریا هۆزێ لە تەکهۆزێ تر، یا نەتەوەیەک لەگەڵ نەتەوەیکی تر کەئەم ئاگاداری یەش لەنەسل و بەرەیەکەوە، بڕواتە نێو نەسل و بەرەیەکی دیکەوە، دیارە ئەگەر زمان نەبوایێ قەت ئینسان نەی ئەتوانی تائەم رادە لەزانست وزانین وژیارو شارستانیەت کە رەستەی مادی و مەعنەوی، ئاواسەرکەوێ و تەرەقی بکا.

بەلاّم لێو، دیارە ئەم ئەندامەش نەخشێ زۆر گرینگ و بەر چاوی لە قسە کردندا بۆ هەیە، چونکا زۆرێ لەمەقاطع ودەر برینی بێژەوپیت، لەڕێگای لێوەوە ئەدا ئەکرێ و ئەنجام ئەدرێ، سەرە رای ئەمانەش لێو بۆجاوینی خواردەمەنی و پاراستنی رتوبەت و نم داربونی زار و خواردنەوەی ئاو، بە مرۆڤ کومەگدەکا ئەگەر خوالێوی عەتانەکردبا مەسەلەی خواردن و خواردنەوەو تەنانەت دیمەنی مرۆڤ لەبەر رژانی ئاولە دەم وزارەوەو ناتەوانی ئینسان لەئەدا کردنی زۆرێ لەپیت و بێژەگەل بارێ ناحەزو خەفەت باری بۆ مرۆڤبەدی ئەهێنا.

لەبەر ئەوەی کە دەرکی حەقیقەت و راستی و دروستی لە پلەی یەکەم دا، بە چاو و زمانە جادوا بەدوای ئەوانە خوابە مەسەلەی ئەقڵ و ژیری وڕێنوێنی ئەقلانی و فیتری ئیشارە و ئاماژەدەکا تەنانەت تەعبیری ئایەتەکە (هیدایەت و رێنوێنی تەشریعی) کەبەهۆی ئەنبیا و ئەولیا و خواناسانەوە ئەنجام ئەگرێ دەی گرێتە بەرخۆی، رستەی **(وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ)** ئێمە: (خوا) ئەومان بۆرێگای چاکە و خراپە ئاگادارو رێنوێنی کرد، سەرەرای ئەوەی کە مەسەلەی ئیختیارو ئازادی ئیرادە ولێ نەوینی ئینسان بەیان دەکا، بەسەرنج دان، بەوەکە (نجد) بە جێی بڵیند ئەڵێن، ئیشارە بەمەیەکە پێوانی رێگای چاکە خاڵی لەگیرو کەند و کۆسب و دەردورەنج نیە، هەر بەو جورەی مرۆڤ کە لەخوارەوە

بۆلای سەرێ هەڵ گەرێ توشی تەنگەنەفەسی دەبێ و ماندو ئەبێ، پێوانی رێگای شەریش رەحمەتی هەیە، چەن باشە ئەگەر پیاو بتوانێ رێگای چاکەو پیاوەتی هەڵبژێرێ وئەو رێگاباشە بگرێتە بەر.

ئەبێ ئەمەیش بزانین کەهەڵ بژاردنی رێگای چاک و خراپ بەدەس ئینسان خویەتی کەئەتوانێ چاو، زمان و گشت ئەندامی لە رێگای چاکە یا خراپە، حەلاڵ یا حەرامدا بخاتەکارو لەدوشا رێگای چاکە و خراپە یەکێکیان بگرێتە بەرو هەڵی بژێرێ.

ئەوەیە کەوتراوە ئەی رۆڵەکانی ئادەم ئەگەر زمانت ویستی بەرەو حەرامت بەرێ **دولێوت لێک بنێ تا زمانت لە ئیختیارت دابێ و ئەگەر چاوت ویستی بۆلای حەرام سەرنجت را بکێشێ پێلوی چاوت لێک بنێ، تابۆلای حەرام و ناشەرعی نەڕوانی وتۆ بۆلای نامەشروعێ رانەکێشێ، چاو لە خراپە بنوسێنە وبیچوقێنە.**

بەم جۆرە خوا هۆی کونتورۆڵی ئەم نیعمەتە گەورانەی پێ داوین و ئەمەیش یەکێ ترە لە ئەلتافی خودای رەحمان.

جێگای سەرنج دانە، ئەم ئایەتانە کەرامان گەیاندن لەبابەت زمانەوە ئیشارە بەدولێو کراوە کەچی لەبابەت چاو، ئیشارە و دیاردی بۆ پەڵکی چاو، نەکراوەو ناوی نەبریاوە، ئەمە خۆی بەرواڵەت لەبەر ئەمەیە کەنەخشی لێولەقسەکردن و خواردن و خواردنەوە و شتانی تردا زۆر لە پێلوی چاوگرینگ ترە، یائەوەیە کە کونتورۆڵی زمان لەکونتورۆڵی چاو زۆر زۆر گرینگتر و چارە سا[illegible]ترە و، چاو کەمتر چارە نوس دیاری دەکا ئەوەیە کەکورد دەڵێ:-

**قسە بی چێژە دای بێژە، بی هاوێژە**
دیارە قسە کەوتە زاری کەوتە شارێ
زمانی عەبدی قەڵەمی خودایە
ئەگەر زمان بێڵێ سەر سلامەتە
زمان بەهەمو باریکدا دەگەرێ
زمانی خۆش لەبەهەشتەوە هاتوە
زمانت بەبڕین بچێ (بۆ ئەونە چەپرەکە)

زمانتگریٚ بده ـ زمانی لەبەری پێی دا (بو هەڵخزاندنی خەڵک).
زمان هەتا توٚم جیرانی ـ خوٚشی نابینم لەگیانی.
زمانی بریٚک چەپرەکە (واتا: زمانی لەئیختیاری خویٚدانیە).
لەبابەت چاویشـکورد دەڵی:
چاکەی بەچاو دەداتەوەپاچاو پیسە و چاوی لە بەرد کاردەکا.
چاو بازەو نا بەستریٚتەوە، یا چاوی پیٚ سپیٚ کردن (نابودی کردن) کابرا چاو ترسە نوٚکە.
چاو ترسێن بوە، چاو چاویٚ نابینیٚ واتا: تەم وخەمیٚکە چاو لەچاو هەتەرناکا.
چاو لەچاوداو رو لەرودا واتا: هەمیشە یەکتر دەبینن و ملاحەزەی یەک‌دەکەن.
چاو کە پوٚی لەنیٚودانەبا یەکتریان دەخوارد واتا: ئەگەر گەورەی بنەماڵە، نەبیٚ چکوٚڵەکان ژیانیان لەیەکتر حەرام دەکرد.
* چاو لەکوٚزی کار ژیلان بکە، جا قاپوچکە لەماستی دابگرە واتا: بەداراییت بروانە، ئەوسا خەرج بکە.
* چاوم ئەویش دەبینیٚ، واتا موراعاتی ئەویش دەکەم.
* چاوم دەپەریٚ: وادیارە میوانمان بوٚدیٚ.
* چاوم رون بوەوە: بوٚ دەربرِینی شادی ❀.
* چاو نوساندن: صەرفە نەزەر کردن یا خراپ بیراز کردن و خراپ چاک کردنەوەی شتیٚک.
* چاوو دڵت رون، کەسیٚکت‌لەدور ولاٚتەوەهاتوە،چاوت‌رون.
* چاو و روی لەکەس نایشیٚ، بیٚ ملاحەزە یە.
* چاوی بەرایی نادا بی‌بینیٚ، ناتوانیٚ لەرقا تەماشای بکا.
* چاوی تیٚر نابیٚ، یا چاوی خوٚت خوردەوەبکە، دیقەت بکە وورد بەوەوجوان بنوارە.
* چاوی خوٚی نەبیٚ، کەسیٚ‌تر نابینیٚ خوٚ بەزل زانە.
* چاوی خیٚل بو یانی زوٚری چاوە روانی کیٚشاوە.

* چاوی  دو سەرەیان پیٚ هەڵ نایێ: یانی زۆریان رق لیٚ یەتی.

* چاوی  دەچیٚتە پشت‌سەری: تورە دەبیٚ.

* چاوی  دەڵیٚی کەشکە فەریکەیە، یانی: چاو لەکالانی چاوی دا دەرپەریوە، ئەونەزل و زەقە.

* چاوی رێشکە و پیٚشکە ناکا، یانی: بیٚ سەوادە، یانوری چاوی کە مە بەئاستەم سۆمای ماوە.

* چاوی رێشکە و پیٚشکە دەکا، واتا: بەهەڵەدەبینیٚ.

* چاوی رەشی کاڵ بوەوە: بیٚ هیوا بو.

* چاوی سور بوەوە، : یاغی بو.

* چاوی نوساندو زاری کردەوە: بیٚ باکانە دەسی کردبە غەیبت کردن و قسەی خراپ و ناشیرین وتن.

* چاوی قەل، تیٚی فسیوە  چاو ریبۆقاوی و چلکنە.

* چاوی کوێر فرمیٚسکی کرد، واتا: لەکەسیٚکەوە، کە چاوەروان نەبوبی، چاکەت پیٚ بگەینیٚ.

* چاوی لەبەری هەڵنایێ شەرمی لیٚ دەکا.

* چاوی لەدەریٚ خۆڵی تیٚ وەری: کەسیٚ کە چاوی لە ناموسی خەڵک‌بو، خاکی گۆڕ چاوی ئەوی پڕ کرد، لە تۆزوخاک واتا: مرد.

* چاوی هەر بەرپیٚ خۆی دەبینیٚ واتا: دەرکی کەمە  یا دەڵیٚن: چاو کەژاڵ، چاو بەڵەک، چاو نەزیر.

* چاو شین، چاو مۆن، چاوترساو، چاورەق، چاورەش چاو جوان، چاو ئەستیٚرە، چاو گەلاوێژ، چاو پیس چاو توروکاو، چاو پروش، چاو تیژ، چاو بەسام، چاو گوشتن، چاو سور، چاو نەرم، چاو چنۆک، چاوە چاو، چاو ئاڵ، چاو ئاسک، چاو ئاسکۆڵ، چاو قوڵ، مرۆف ناوبریٚ تەماشای چاوی بکا، مرۆف لەچاوی تیٚر نابیٚ، چاوخیٚل، چاوگەش، چاو مەری، چاو مەست، چاو خومار، چاو مۆڕ، چاو حیز، چاو دلۆپاوی، چاو چاڵە هەرزن، چاو بۆق یابەق، چاو مۆلەق، چاو لەحەوا، چاو بیٚبرژانگ: بژانگ، مژۆل، بر ژۆڵ، بژانگ وەریو، یا هەڵوە ریو.

چاو پیاڵە، چاو داقڵیشاو، چاو بەرۆندک، چاو بەفرمیٚسک، چاو فرمیٚسک ئاوی،

وەریو، یا هەلوە زیو.

چاو پیالە، چاو داقلیشاو، چاو بەروندک، چاو بەفرمێسک، چاو فرمیسک ئاوی، چاو تۆقیو، چاو نەترس و چاو خۆین ئاوی، چاو گۆمەخوین، چاو باز، چاو سەقر، چاو عوقاب، چاو هەلو.

شاعیری ناودار مەلا صالحی خەریق بەشیعر فەرمویەتی:

# گوڵشەن

چاوەکەم ئەمڕۆ لەگوڵشەن گوڵ بەعیشوە خۆی نواند.

نەک نمەکگیر بم‌بەچاوی تۆقە سەم هیچ نەم دواند.

**نوکتە: سەمەروسەیربونی چاو.**

چاو: زانایان چاو بە یەک دەزگای دوربینی وێنە هەڵگری و عەکاسی تەشبیهدەکەن کە بە عەدەسی (نیسکی) زۆر جوان و زەریفی خۆی لەشانۆ و صەحنەگەلی جیاجیا عەکس بەرداری دەکا، وینە وعەکس گەلێ، کە لەباتی فیلم لەسەر روی (شەبەکیەی چاو) مونعەکیس ئەبێ، جا لەبەر ئەوە بەهو ولە رێگای ئەعصابی بینایی یەوە، دەچێتە نێو مێشکەوە، ئەم دەزگا وێنەو عەکس هەلگرە، کە زۆر جوان وزەریف و وردە، لەشەوو رۆژدا ئەگونجێ هەزاران وێنەلەشانوو سەحنەگەلی جیاجیا هەڵگری، بەلاّم لەزۆر بارو بابەتەوە ناشێ و نابێ، تەنانەت لەگەڵ پێشکە وتوترین دام‌ودەزگای عەکس و وێنەهەڵگری وەیابە دەزگای فیلم بەرداری تەشبیە یا بەراورد بکری، چونکا:

١ـ دەریچە و دەریچەی نور (یا: دیافراگم) لەم دەزگایەداکە هەمان (گلینەیَ چاوە، بە تەوری خود کار لەبەرانبەری نوردا دەگۆر درێ و تەغیری دیمەن و بیچم‌ئەدا و لەراست نوری قەوی دا تەنگ‌تر و لەراست نوری کزداگوشادتر دەبیتەوە، کەچی دەزگای وینەگری دەبێ بەهوی خەلکەوە تەنزیم و تەکوز بکری.

٢ـ عەدەسی چاو بەراوە زوی تەواوی عەدەسی گەلێ کەلە دوربینی وینە هەلگری دنیا بەکار براوە، هەمیشە و بەردەوام‌دە گۆردرێ و تەغیری شکلْ ئەدا.

ڕێگای عەزولانی یەوە، کە دەورو بەری عەدەسی یان گرتوە، کە ئەوە دە کیشن یا ڕەهای دە کەن، ئەنجام دەگرێ بە جۆر ێکی واکە یەک عەدەسی چاو، بە تە نیایی، کاری بە صەدان عەدە سی ئەنجام ئەدا!

٣ـ ئەم دەزگا وێنە هەڵگرە، کە چاوی ناوە، لە چوار لای جیاجیاوە، حەرە کەت ئەکا و ئەروا وەئە توانێ بە کۆمەگی عەزولانی چاو، بۆهەر لایەک حەرە کەت بکاو بڕواو وێنە هەڵ بگرێ، یاوێنە گەری بکا.

٤ـ نوکتەی گرینگتر لێرە دایە، کە لە دور بینە کانی وێنە هەڵگریدا، ئە بێ فیلمە کان، بگۆڕ درێن و عەوەز بکرێن، وە یەک حە لقە فیلم کە تەواو بو، ئەبێ خەلقەیێ تر لە باتی ئەوە کە تەواو بوە دابنرێ.

بە لام چاوی ئینسان لە تەواوی ژیانیدا فیلم بەرداری و وێنەگری دە کا، بێ ئەوەی شتێکی بگۆڕدرێ یا عەوە زبێ ئەمە لەبەرئەوەیە، کە لە بەشی (شە بە کیە)ی چاوداکە تە صویرو وێنە کان لە سەر روی ئەوە بنەخشێ و مونعە کیس بیێ دو جۆر سیلول وجودی هەیە ١ـ سیلولی مەخروتی یاکەللە قەندی ٢ـ سیلولی (ئوستوانەیی یا بازنەیی) کە دارای مادەیەکی زۆر حە ساسە؛ لە راست نور دا، وە بە کە مترین تابشی نور تەجزیە و بەش بەش دەبێ و شەپۆل و ئەمواجێک بەدی دێنێ، کە دە چێتە نێومێشکە وە و لە پاشان ئەسەری ئەوە لادە چێ وئە روا،وە (شە بە کیە) دوبارە ئامادەی وێنە هەڵگرتنی تازە دە بێتەوە.

٥ـ دوربینی وێنە هەڵگری، لە کەرەستە گەلێکی زۆر مە حکەم و پتە و ساز دراون، بەڵام دەزگای عەکاسی و وێنە هەڵگری چاو بەئەندازە یەک جوان و ز ەریف و لەتیفە کە بە چکۆڵەترین شت دە روشێ، جاهە رلە بە رئە مە لە مە حفەزە و کالانێکی مە حکەمی ئێسقانیدا قەراری گرتوە و خوالە و شوێنەی داناوە، بەلام لە عەینیزەریفی و جوانی و ناسکیدا زۆر لە ئاسن و پۆلاپردە وام ترە.

٦ـ مەسەلەی تە نزیم و ڕێکی و پێک کردنی نور، بۆ فیلم بەرداران و وێنە گران زۆر گرینگە، وە بۆ ئەوەی، وێنە کان روناک و جوان بن جار جارە پێویستە چەن کات و ساتێ خەریکی تە نزیم و تە کوز کردنی نور و بە رکوڵ و پێشە کی ئەوە بن کەچی چاو لەهەر هەل

و مەرجێکدا لەنوری قەوی و کز یا نوری مام ناوەندی، تە نانەت چاو لە تاریکیشدا بەو مە رجەی نورێکی کەم‌لە وێدا هەبێ وێنە بەرداری دەکا ئە مە خۆی لە عە جباتی گرینگی چاوە.

٧ـ جار جارە ئێمەلە روناکایی یەوە دە چینە بەر تاریکایی، وەیا یەک دەفعە و لەناکاو چرای بەرق دە کوژێتە وە و لەو دەمەدا چاومان هیچ شتێک نابینێ بە لاّم کەم کەمە چاوی ئێمەمانان بەتەوری خود کار، باری خۆی لە گەڵ ئەو نورە کزە تەتبیق و بە راهبەردە کاو خۆی لەگەڵ دەگونجێنێ بە جۆرێکی واکاتێ دەروانینە، ئەم لاولای خۆمان کەم کەم شتانێ زۆر دە بینین و دەڵێین: چاوی ئێمە خوی بە تاریکی گرتوە، وە ئەم ئەعبیری عادەتە، کە بە ئاسانی بە زماندا دێ‌و ئەروانە تیژەی مەکانیسمێ زۆر ئاڵۆز و پرپێچە کە لە چاودا قەراری گرتوە یا وەستا وە و ئەتوانێ لە ماوە یەکی کە مدا لە گەڵ هەل و مەرجی تازە خۆی جۆر بکاو خۆی بخونجێنێ.

بە راوە ژوی ئەم واتایە، لە کاتێکدا کە لە تاریکایی یەوە ئەچینە بەر روناکیش هەروا، چاوی مرۆف تەم دەکا وەکو ئەوەی بە رۆژ دە کەوێ و چاک نابینێ، هەروەکو لە تاریکیدا، لە سەرە تاوە وای لێدێ، کە لە سەرە تاوە لەتاریکی دە چێتە بەر روناکی، چاو لە بەر نوری قەوی تورکە تورک دە کا، بەلاّم دوای ماوە یەک، خۆی لەگەڵ ئەونورە قەوی‌یەدا دەگونجێنێ و بە ناو خو دەگرێ، ئەم شتانە قەت لە دەزگای فیلم هەڵگریدا وجودی نیە.

٨ـ دەزگای فیلم و وێنە هەڵگری لە فەزایە کی بەرتە سکدا ئەتوانێ فیلم و وێنە ئاماد، بکا کە چی چاوی مرۆف تەواوی نیودایرەی ئاسۆیێ، کە لە بەرانبەری ئەودا رابگیردرێ ئەی بینێ و بە واتایێ‌تر ئێمە تارادەی ١٨٠ پلە دایرە وجە غزی دەورو بەری خۆ مان دەبینین لە حاڵێکدا کە هیچ دام و دەزگای وێنە هەڵگری بەم جۆرە نیە، تەنیا چاوە ئاوایە.

٩ـ یە کێک لە وشتە سەیر و سەمەرەکەی چاوی ئینسان ئە مەیە کە هەردو چاوی مرۆف کە هەریەکە، بە تەنیایی خۆی دەزگایە کی سەربە خۆیە، بۆدیتن و وێنە گرتن، بە جۆرێکی واتەنزیم کراوە، کە وێنە گەلێ کە لەوانە بە دەس هاتون دروست دە کەوێتە

سەر نوختە و خاڵێک بە جۆرێکی وا کە ئەگەر کە مێ ئەم تەنزیم و تەکوزە بترازێ و سەربکا، مرۆڤ بە هەر دو چاو شتێک بە دوشت ئەبینێ! هەروەکو مرۆڤی خێل (و دوبین) بەم واتا: دە بیندرێ.

١٠ـ نوکتە یەکی دیکە ئەمەیە، کە تەواوی شانۆ و صەحنە گەلێ کە چاو لەوە وێنە هەڵدەگرێ، بە جۆرێ بەراوە ژو لە سەر روی شەبەکیەی چاودەکەوێ، لە حاڵێکدا کە ئێمەمانان هیچ شتێک بە راوەژو یا بە پێچەوانـا نابینین ئەمە لەبەر خوگرتنی چاو، و پاراستنی نیسبەتی ئەشیا سەبارەت بە یەکترە.

١١ـ سەتحی چاو ئەبێ هەمیشە تەرونما وی بێ بە جۆرێکی وا کە ئەگەر چەن سەعاتێ ویشک بێ سەخت زیان دەبینێ ئەم روتو بەتە بەر دەوامە لە غودەگەلی فرمیسک و رۆندک دابین ئەبێ، کەلەلایەکەوە، دەچێتە نێوچاو و لەرەگەزۆر باریکەکانەوە، کە زۆریش زەریف و نازکن لەگۆشەی چاو راوەستاوە،دەرواتە دەرێ و دەچێتە نێو لوت و کە پۆوە و دفن و لوت تەرو نماوی را دە گرێ.

ئەگەر غودە فرمێسکەکان ویشک بن چاو توشی بفە و مەترسی ئە بێ و حەرەکەتی پێلوی چاو، ناگونجێ یائەگەر زیاد لە رادەیش حەرەکەت وکار بکەن هەمیشە فرمێسک بە سەر گۆنەدا، شۆراوگە، دە کا، یائەگەر رێگا باریکەکانی دەر چونی ئاوی چاو بگیردرێن ئەبی بە ردە و ام دەسرۆکەیەکمان بە دە سەوە بێ، تا ئاوی چاوی پێ بسرینەوە، کە بە خور دێتە خوارە وە، ئە مەش ئەبێتە هۆی زەحمەت و مەینەت.

١٢ـ تەرکیبی فرمێسک و رۆندک،(ئاوی‌چاو) تە رکیبێکی زۆر ئاڵۆزاو و پرپێچە، وە زیاتر لە دە عونسورساز ئەبێ، کە بە تێکرا باشترین و موناسب‌ترین مایعە بۆ راگرتن و پاراستنی چاو.

بە کورتی و بە کوردی بڵێین: چاوئە ونە شتێکی قەوی و زەریف و عەجباتە، کەئەبێ، چەندین رۆژ دابنیشین و لە با بەت چاو، قسە بکەین و چەندین کتێب و پەراوە، بنوسین و بەو هە موەشەوە، کە تەماشا دە کەین و دە روانین و ورد ئەبینە وەتەنیا یەک تێکە پیو، دە بینین!

زمان: زمان و سەیر و سەمەرە و عەجباتی زمان: زمانیش بە نۆ بەی خۆی لەئە

ندامه زۆر سەر سورِ هێنه رەکانی لەشی ئینسانه، ئەرک ونه سپاردەیێ، زۆری به ئەستویە، سەره رای ئەوەی که زمان بۆقوتدانی خۆراک شوێنێ زۆر گرینگ و دیاری هەیە، له جوینی خوراکیشدا، ئەخشێ زۆر بەرچاوی هەیە، چونکا هەمیشە پارو ه خۆراک ئەخاته بەرجەنجەری ددان بۆ جۆین، به لاٌم ئەم کاره ئەونه ماهرانه و چاک ئەنجام ئەدا کە خوێشی لەئازار دیتنی دیان ده پارێزێ، له حالێکدا هەمیشە له نێزیک دیان و به دادنەوە نوساوە!

جار جاره لەناکاو لەکاتی خۆراک جاوێن دا زمانی خۆمان دەگەزین! وهاوارمان لێ بلێند ئەبێ و تێ گه ییوین که ئەگەر ئەو مەهارەته لەزماندا نه بوایێ چمان به سەر دەهات!

له زیمنێشدا زمان دوای خواردنی خوارده مەنی لەنێو دەم و زار و ددانه کاندا دێ و دەچێ و پاک و تەمیزی دەکاتەوە.

لەم کارانه گرینگ‌تر مەسەلەی قسه کردنه که زمان به هاتور چۆی توندو مونەزەم و له پەستا پەستای خۆی و بزوتن بەهەر شەش‌لای زا را قسه کردن به هۆی زمانەوە ئەنجام ئەدرێ.

سه رنج راکێش ئەمەیه که خوا بۆ قسه کردن یا و تووێژ کردن که رەسته یەکی لەئیختیار مرۆڤ، داناوه که زۆر ئاسان و بەسانایی، زمان و قسه کردن به خەلْک دراوە، نه ماندوبون دینێ و نه مەلا لێ پێش دێ و نه خەرج و دراویش هەلْ دەگرێ.

لەوه سەیرترو سه رنج راکێش‌تر مەسەلەی لێهاتوی قسه کردنه که له ئینساندایە، که له گیان و رۆحی مرۆڤ دا بەوەدیعه و ئەمانەت دانراوه که مرۆڤ ده توانێ جومله به ندیێ زۆر له شکلْ و بیچمی جیاجیا بۆ دەربڕینی مەبەستی زۆر متنوع و جیاجیای خوی ئەنجامی ئەدا.

لەوەیش گـرینگتر لێها تـوری ئینسـانه لەدانانی بێژه و واژەی جیـاجیـاَدا کـه بـه خوێندنەوه و فیرْبونی هەزاران ناوياشت که له دنیادا هەیە، گرینگی زمـان بـا شـتر دەر دەکەوێ، راستی راستی ئەبێ بلێین **اَلْعَظَمَةُ لِلّهِ الواحدِ القهارِ.**

له پاشان لەئایەتی یازده خوا فەرمویە: و هدیناه النجدین، واتا: خوا مرۆی بۆ دو رێگای چاکەو خرا پەهیدایەت و رێوێنی کودوه، بێشک ئەرک و ئەسپارده بێناسین و

ئاگاداری ناگونجیٰ و خوا بە پێی ئەم ئایەتە ئاگاداری لە ئیختیاری ئینسان داناوە.

ئەم ئاگاداری یەش لەسیٰ رێگاوە ئەنجام ئەریٰ:

١ـ لە رێگای ئیدراکاتی ئەقڵی و ئیستیدلال و بە ڵگەوە

٢ـ لەرێگای فیترەت و وژدانە وە، کە بیٰ نیاز لە ئینستیدلال و بە ڵگەیە.

٣ـ لە رێگای وەحی و فێر کردنەکانی ئەنبیا و ئەولیا و خواناسانە وەیە وەئەوەی کە بۆ مرۆڤ لە رێگای تیٰ گەیشتن و پیٰ گەیشتن پێویستە خوا بەیەکیٰ لەم سیٰ رێگایە، یـا لەزۆر شوێن لەهەرسیٰ رێگاوە خوا فێری مرۆڤی کردوە.

دیارە ئەگەر فێر کردن و بارهێنانی ئینسان بە هە ڵە نە بیٰ عەشق و ئەوینی ئینسان بە چاکە و چاکە کردن زۆر، زۆرە وئەگونجیٰ تەعبیر بە (نجدين): ئەمەبیٰ چونکا جـیٰ بـە جێی بە رزوبڵیند، ئاو وهەوای چاکترو بە کە ڵکتری هە یە و لەبابەت خراپەشەوە لەبابی تەغلیبە (هە روەکو قمران لەباتی شمس و قمر دە و تریٰ) دیارە ئەمە ئیشارە بە ئـاشکرا بونی رێگای خێر و شەڕە هەروەکو یەکسەرزەوی بڵیند لە دورەوە  دیارە لەچاو ئەدا.

# فەرهەنگ و جوانی

لەراستیدا بەتێ روانینێکی رواڵەتی و زاهیر بینانە فەرهەنگ بەناوی تابیع و پەیرە و بۆ کۆروکۆبونە وەکان لەبەرچا و دەگیردرێ «بە راوە ژوی ئەوەی کۆرێ زۆر تەسەوری دەکەن» ئۆگربونی گشتی و تێروانی قاڵبکراو، بەسەر «رەوانا ناسی، کۆمەڵگا ناسی مارکسیسی قسەی لێ بکرێ، هەرچەندە مارکسیسمی کلاسیک ئەم ئۆگربونە بە جۆرێکی ئیفراتی بەیان دەکرد» گۆرانکاریەکانی تازە کردنەوەی نەزەر خوازانەیەککە تا کەتاکێکی وەک «کئوورک، ئانتونیو گرامشی، لوسین بگدمن، هی دیکەش کە لەمارکسیسم نیشانیان داوە، بۆ تەعدیلی تێ روانی کلاسیک کۆشاون» بۆبیرورای لوسین گلدمن بروانئە فێرگە و فەرهەنگ «جەلالی ستادی» ئەبێ وریا بین مەبانی بیروهزری زانینەکانی ئینسانی ر ۆژاوایی بەناوی دەرسی «کۆمەڵگاناسی، مرۆف ناسی، رەوان ناسی و ... بەناوی حەقایقی عیلمی بە دەرس نەوترینەوە نەوە کوبیرورای ئۆمانیستی و ماتریالیستی بخزینە مێشکی مێرمنداڵ و گەنج ولاوەکانمان، چونکا زانینەکانی تازەی ئینسانی لەهەمو حەوزە و ریشتەکاندا چ لەحەوزەی مارکسیستی، ساختار بۆکشان، کارکردی، پوزیتیویتی، رەفتار بۆکشان، پەدیدار شناختی، یائینسان ناسی ژینی، مرۆف یا مەردوم ناسی فەرهەنگی، کۆمەڵگاناسی ئیرتیباتات، رەوان ناسی، ئابوری، رامیاری و ... ریشە و

رەگزیان، لەمەبادی و میراتی بیرکردنە وەی هزری نۆمانیستی و فەلسەکانی چاخی **تازە و میتولۆژی پوزیتیویتی دا هەیە**، بەشێوەی **ماهوی وزاتی لەگەڵبۆکشانی دینی و خودایی دا** دژایەتی بۆ هەیە، جانەگەر ئەوانە بەدەرس بوترێنەوە ئەبێ بژارە بکرێن **تامیراتی ئەندێشەی نۆمانیستی بەناوی مەعریفەت وزانین دەرخواردی لاوانی ئێمە نەدرێ«مەبانی کۆمەڵگاناسی** هانری مندراس، به سەرەتای مەدەد پور ۱۳۶۹».

**فەرهەنگ بەلای با وباپیرانمانەوە** بەواتای **«ئەدەب»** بوەو لەواتای **فەزیلەت و** کەماڵیشدابە کار براوە، **لەکوردە واریدا** زۆرتر فەرهەنگ بە واتای ئاوەز، **ئەقڵ،شعور، ئەدەبی نەفس، ئەدەبی دەرس، ئەدەب‌لەهەستان و دانیشتن و قسەکردن** و **رێگا** رۆیشتندا، بەکار براوەو بەکار ئەبرێ.

لەسەر بناغەی هزری ئیسلامی فەرهەنگ رۆح و گیان و باتنی شارستا نیەتە **و** تەمەدونیش بێجگەلە زاهیری فەرهەنگ شتێ ترنیە، فەرهەنگ خۆی بەرهەمی پەرەگرتنی **تەفەکورە**، جاکەوابێ، تەفەکور بەناوی باتنی فەرهەنگ لەپەرەگرتنی **خۆیدا** فەرهەنگ بەدی ئەهێنی، گۆڕان و گۆڕاندن، دامەزاندن و پەیدا بونی تەمەدون بەنەتیجەی گۆڕان و گۆڕاندن و پەرەدانی پەیدا بونی فەرهەنگی ئێمەیە.

لەم رووەوەیە، کە **فەرهەنگ بە رۆح و هۆی ژیانی شارستا نیەت ناو ئەبەین و** جەنگ ورو بەرو بونی شارستا نیەکان لەبنەرەتا بەجەنگ و ملە بەملانێ **کردنی** فەرهەنگەکان ئەزانین، بەگۆڕانی فەرهەنگەکان، شارستانیەتەکانیش دەگۆڕێن، **بەپەیدا** بونی فەرهەنگەکان، شارگەل دادەمە زرێ، رامیاری، ئابوری، نیزا می، کرین و فرۆتن پێوە ندیەکان و گشت ئەوانەی کە بەکۆر و کۆبونە وەکان ناویان ئەبەین، بێجگە لەشێونی جیاجیای شارستا نیەت‌شتێ ترنین کەخۆی رەنگدانە وەیەکە، لەفەرهەنگ، ژیان و گوڵکردنی شارستانیەتی ئێمەو کۆڕوکۆمولگا، پێوەندی بەژین و بەر و میوەی فەرهەنگەکانەوە هەیە، تەفەکور، وجەو هەرو باتنی فەرهەنگ ساز ئەدا.

**لێرە وەیە کە راپەرین و شۆڕش و گۆڕان هە میشە لەراپەرین و گۆڕانی بیروهزریەوە، دەس پێکراوە**

## زانین و جوانی

**نوکته:** شاعیری و هەستیاری یانی ئاگایی و ئاگاداریش گرینگیکی پاک و بێخەوشە، کە لەعەشق و ئەوینەوە، دە دەڵێتە نێو دڵوهەناوی ئاگادارو ئەویندار.

**شیعرو هۆنە لەناسین و زانین و لەمەعریفەت و شوعورە و... و سەرچاوەی هەمو** ریشەی گیای شیعر شعورەیانی گیانی گیای شیعر لەزەوی شعوردائەروێ و سەرهەڵدە **داوەگورویێ** وز یاددەکا و بنجدائەکوتێ بە خودا دێ و شاخە و بەرگ و تەرز **بەتە رزیێ جوان** و رازاوە بەم لاو بە ولادا دەها وێژێ لەکەوناراوە و تویانە ئەوەی لەدڵەوە **دێلەسەر دڵ دەنیشێ** جانەگەر شاعیر لەدەرونی بە سۆزە وەو لەروی ئاگاییەوە شیعربڵێ: دە رونی بیسەرو خوێنە ری شیعر و هۆنە نیل ئەداوگزینکی نوری ئیلاهی دەخاتە نێو دڵ و دەرونی ئۆگردارانی شیعرەوە، هەل ومەرجی پێداویست بۆ شاعیربون و بونە **هەستیار فێربونی زانست وزانینە**، بەلام مەرجی تەوا و وکافی عەشق و ئەوینە، زانا بەفیرَ بونی زانست و زانین دەبێتە زانا و هوزانێ تەواو، بە لام شاعیر و هەستیار بە فێر بونی زانستی، زانینی شاعیری و هەستیاری نابێتە هەستیار و شاعیر، ئەوەی دەبێتە هوی شاعیری **عاشقی وئەویندار بونە**، مرۆفی عاشق دەگاتە عیرفان و خواناسین مرۆف لەتێشکانی عەشق وئەویندا دەگاتە عیرفان و لەسەرکەوتیشدا هەروایە ئەویندار دەگاتە عیرفان و خواناسی هەردو رێگا، رێگای مەعریفەتی ئەوە، کە داگری ناسینی مەنشەئی واحید-ی جوانی و زێبایی گەل و ئەزمونی جوانی و خوشیکییە لەراپەرینی ئەقل و زیهنی و رۆحی بەرەولای کُلُّ جەماڵ وکەماڵ.

قسە کردن لەوەکە جوانی و زێبایی چییە؟ خۆی هۆی فیتنە وئاژاوەیە و بەڵکو فیتنە و ئاژاوەگەلە، لەراستیدا ئەوەیە: کە **ئەفلاتون رای گەیاندوە** ئەبێ بزانین روانگای **عرفانی** ئیسلامی چتگە لێکە زیاتر لەقسە و رای ئەفلاتون و لە زۆر باروبا بەتەوە بە رزو تەرز ترە لەقسەی ئەفلاتون و ئەویش ئەمەیەکەبۆ وێنە ئەگەر لەجیهاندا بەم حوکمە (ماست سپی یە؟ دگەین ئەم حوکمە لێرەوە سەرچاوە دەگرێ کەهەمو ماستێ سپی یەو بۆنمونە **ماستی** رەشگیرنایێ، جا لێرەوە بەم حوکمەگە یشتوین کەهۆیها و بەش بونی **گشت ماستێک سپی بونە، ئەفلاتون دەپرسێ**: هۆی ها و بەش بونی جوانیلەچی دایە؟ **زانایانی جوان ناسی** رایان گەیاندوە: گەردنی کەشیدەی ئەسب جوانە، کلک هەلگرتنی ئەسب لە

سواریدا جوانە، گولە باخ جوانە، پێوەندی لەنێوان ئەم جوانیانەدا لەچی دایـە؟ **جوانـی حەقیقە تێکی موجە رەدە،** کەلە مەحسوسات و مـەزاهـیر و نـوێنگەدا خۆدەردەخـا و ئاشکرا دەبێ و لەچاو ئەدا، دیارە ئەم حوکمە هێمان لەم چاخ و رۆژگـارەشدا پتەوترین قسەو بیروڕایە، کە لە بابەت زێبایی و جوانـی یـەوە ڕاگەیـاندراوەو لەدنیـایی بـەڵگە دا، قسەیێ لەمە **جوانتر و پتەوتر نەوترا وە یانە بیسراوە،** لە لایەکـی تـرەوە لە عیرفـاندا ئەبینین کە زات و گیانی ئێمە جۆرێ بیچمی گرتوە و ساز دراوە، کە ئێمە ئەهلی جوانینٚ، جوانی خوازین ئەوەش کە دەڵێن: «ئینسان و ئەنزان بە خۆرسک جـوانـی خـوازە» بـەچ واتایە، بەم واتایە: کەئەگەر جوانێکت دی، جوانچاکێکت دی هەڵی بژێرە، ئەگەر بۆسۆزیا جوانتر یا جوانچاکترێکت دی هەڵی بژێرە چونکا مرۆف بـە خـۆرسک جـوان خـوازە، تونێش بیخوازە و لەهەوا بیقۆزەوە، هەروا هەڵبژێرە و پەسەندیان بکە، ئەمە تاقامی قیامەت بەردەوامەو دەرێژەی ئەبێ ببێ، مرۆف لەزاتی خۆیدا ئامادەیی هەیە، بۆدەرکی جوانی و بینیهایەت، جوانی یانی، مەیلی بێبرانە وەی بۆ جەماڵی موتڵەق هەیە، ئەسڵ و بنەرەتی ئۆگربونی ئێمە بۆلای جوانی، بۆکشانی ئێمەیە بۆلای جوانی موتڵەق، جاکەوابێ بەقسەی **ئە فلاتون جوانی حەقیقەتی** موجەرەدێکە کەلە مەلموسات و مەزاهیرو نوێنگەدا زاهیر دەبێ، ئەمەیە بیرورا لەبابەت خوشیکی و جوانی و زێبایی یەوەکە بیروباوەری خاوەن بە ڵگانە، شاعیری و هەستیاری زاروکی جوانی یە، مەبدە و مەبانی جوانی یە، قۆناخ جوانی یەو مەقصدد و مەبەستی جوانی یە، هەستیاری، شاعیر، عاشقی و ئەوینداری، عەرفان، تەجرید و بێخەوشی یـە، ئـەبێ بـزانـین هـەم عـارفی رەبـانی **مـەلائەحمەد حـزیری، هەمحەکیم ئەحمەدخانی** خەڵکیان بۆبێداری و هوشیـاری بـانگ کـردەوە خۆیـان لە نەفس پەرەستی، لەشەهوەت پەرستی دور خستۆتەوە، قسـە کانیان لە دڵەوە هـاتوە و لە سەردڵ نیشتوە، بە لاّم زەنگی قسە وکەلامی **جزیری ئاهەنگی زوهد** و تەقوا و عیرفانە، بە لاّم زەنگی کە لامی **حەکیم ئەحمەد خانی زەنگی حیکمەت و خۆناسینە** ئەڵێن شمس تەورێزی لەمەولانا جەلالەدینِ پرسی: بایە زید مـەزنترە یـامحەمەد، لەوەلاّمـدا وتی: پرسیارێ سەیردەکەی بایەزید بەندەیێ لەبەندەکانی خوایە وحەزرەت،پێغەمبەری خوایە، وتی: ئەی پۆچ بایەزید و تویەتی: **(سبحاني ما أعظمَ شأني)** و پێغەمبەر فەرمویەتی

**(و ما عرفناک حق معرفتک)** نوکتەی جوان لە زەمیری موخاتەب و موتەکە لیم مەولەوی بێهۆش دەبێ، داستانێ لەمەثنەی یالە دیوانی شمس‌دا خۆی سازی داوە یاخە لگەڵێ زیرەک بۆیان ساز داوە دەڵێ یاری نێزیکترلە من بە منە **(هو اقرب الیه من حبل الورید)** هەر ئەوەی کە شێخی سە عدی فەرمویەتی: مەولەوی دەڵێ نابێ بەئەی هاوار لەخوا بکەین بە ڵکو ئەبێ بە زمانی بایەزیلد بە «ضمیر متکلم» یادی خوا بکەین کەدەڵێ (من نخواهم فیض‌حەق از واسطە = کە هلاک خلق شد این رابطە).

بە لاّم عەلامە **عبدالرحیم مەولەوی کورد** لەئەقیدەی مەرزیەدا بە فارسی فەرمویەتی: (چو بینم در خود از بس روسیاهی = نگنجدای آلهی یا آلهی) کە دو قاعیدەی نیدای قەریب و بەعیدی راگە یاندوە. بەرەی مرۆف لەخوێندەوار ونەخوێندە وارەوە بە دوی دەرمانێ دەگەڕێ کە دەردی هەژاری و دورەپەرێزی خویێ پێ دەرمان بکا، با بزانین دەرمان بەدەس کیە؟ ئایاچگە لەخاوەن بیران وقەڵەم بەدەستان کێهەیە، دەرمانی دەرد بدۆزێتەوە، ئینسان و ئەنزان؟!.

هۆنە:

(تا تە نورت گەرمەکارێکی بکە = تا نە بوێتە کۆتی پێ کۆلکی پنە).

بەڵێ کاری ژیان بەشوێن ئەوەی کە ئینسان دەیەوێ و لێی نادیارە، ئینسان، ئەوکەسە، کە بە زمانی خەڵک و بۆ خەڵک ولە بەرخەڵک بدوێ دەنابۆچی وا (دیۆژێن) فەیلەسوفی ناودار بەئالۆزاوی بە رۆژی روناک چرای هەڵکردبو، بەدوی ئینسان و ئەنزاندا دەگەرا لەنێو (تەن) هادا، خۆی بە تەنها دەزانی، وتیان: ئوستاد لِەچی دە دەگەڕێی؟ وتی: ئینسانم لێ ون بوە، گیانم خەستەی دەستی دەستەی دێو و درنجە وئەنزان وئینسانم ئارەزوە، هەردەڵێ: مەولانا **مەولەوی کوردە** چرای سۆزی گەرمو ئاهی ساردی شەوچەرەی دیوە خانی دڵی سازدەکاو بە شوێن «شەمام تەوێڵەیی» دا، دەگەرێ بە لاّم ئەم لەکوێ و ئەولەکوێ؟

## فه رهەنگ چیە

فەرهەنگ چیە؟ پیوەندی ئەوەلەگەڵ مێژو، شارستانی و ژیان و ژینی کۆمە ڵگادا چلۆنە؟

ئەگەر لەسەر بنەرەتی ئەوەی وا لەجیهانی ئەمرۆدایە «زانینی مرۆڤانی» ناو دەبرێ و لەسەر بنچینەی مەشهوراتی ئۆمانیستی زەمانە، قەستی داوەریمان هەبێ توشی زیاتر، لە دوست تاریف دەبین، کە لە «فه رهەنگ» کراوە، لەسەر بنەمای رێگای‌ها و بەشی و ئاوێتە بون ئەتوانین ئەو تاریفانە بکەینە چەند دەستە.

لەنێوان زانایانی «کۆمە ڵگاناسی» و «مرۆڤ ناسی» و «زانینی کۆمەڵایەتی» ئەونەلێک نێزیک نین لەبابەت تاریفی (فەرەنگ) وە و پێوەندی ئەوەلەگەڵ «شارستا نیەت» و ژیانی مەعنەوی و ئەنبوژەنی مرۆڤدا وجودی نیە، دیارە ئەبێ ریشە و بنچینەی ئەم دژایەتی و تەشەنە ئەبێ لە جەوهەری ئۆمانیستی و ڕەنگ و دارژاندنی ماتریالیتسی «زانینەکانی مرۆڤانی» ئەوەی کە لە ئاخری سەتەی هەژدەهەمدا لەیەک گەرانی تەکوینی تەدریجی دا، پەیدا بوەولەسەتەی ئێمەدابە ناوی زانینی مرۆڤانی ناوی دەرکردوە و ئۆگر بونی ئەوە، بەرە و لای رەوشت ناسی ئەزمونی بۆیی بگەڕێن.

یەکێ لەناودار ترینی تاریفەکان، لە بابەت فەرهەنگەوە تاریفێکە لەلایەن تایلەر Tyilorی خەڵک ناسی ئینگلیسی کە لە ١٩١٧ ز مردوەلە وبارە وە دەنوسێ: (فەرهەنگ کۆمایێ پێچیدە و ئاڵۆزاوە، کە داگری، مەعاریف، بیروبڕوا، هونەر، پێشە، تەکنیک، خوونە خلا ق، قانون، داب و دەستورو باوی نێوکۆڕو کۆمەڵ.

هەمو هەستان ودانیشتنی خەڵک یارە فتارو ئاکارو کردەوەیەک کە مرۆڤ بە ناوی ئەندامی یەک کۆمەڵگا، ئەوە، لەکۆڕو کۆمەڵگای خۆی فێری دەبێ یاوەری دەگرێ و لەراست ئەو کۆڕوکۆمەڵەدا ئەستۆ دارای بەئەستووەیە «روح الامینی مەحمود، مەبانی مرۆڤ ناسی لاپەرەی ١٤٧»

ئەبێ ئەم نوکتە گرینگە بخەینە بیرکە بیرورای مرۆڤ ناسان، کۆمەڵگا ناسان و رەوان ناسانی کۆمە لایەتی رۆژاوایی لەبەر جەوهەرو مەبانی ئۆمانیستی ودارشتنی

رەنگی، ماتریالیستی (زانینەکانی مرۆفانی وکومە لایەتی) دنیای تازە بۆ ئێمە کە نەتێ روانینی روانگای بیرو ئەندێشەی دینی لەدنیا سەیر ئەکەین وئەگەرێن.

بە لاْم (کێ روشە) لەتاریفی فەرهەنگدا دەڵێ: فەرهەنگ بریەتیە لەکۆما یەکێ پێکەوە لکا و لە رێگای جیاجیای بیرو ئەندیشەوە، هەست کردوە، کەم و زیاد ئاشکرایە کە بە هۆی زۆریەی تاکە تاکەوە بە دەس‌هاتوە و بلاْو کراوەتەوەو بۆ ئەوەی ئەم تاکە تاکانە، پۆلی دیارو موعەیەن ساز بدەن، ئەم کۆما و کۆرانە پێکەوە لکاون، بە جۆرێ واکە لەهەمان کاتدا عەینی یە بەکار ئەبرێ.

«تاْلفیردویرە» کۆمەل ناسی ئەلمانی بروای وایە: مەبەست لەفەرهەنگ گردوکۆی هونەری، دینی، فەلسەفی، و باقی بە رهە مەکانی وێنەی یەک کۆمەڵگایە «باتورمور، تی، بی کۆمەڵ ناسی لاپەرەی ١٣٥ تەرجەمەی سەیدحەسەن مەنصور.

لەکەوشەنی «کۆمە ڵگاناسی» و «ئینسان ناسی» زانینی ئەمچاخە «کۆروکۆمە ڵگا ناسی ئۆمانیستیک و ژێر کۆمای ئەوە» بۆکشانی غاڵب ئەمەیە، کە «فەرهەنگ» بە تابیعی کۆروکۆمەڵ «بە واتای پەرەداری ئەوە، داگری هۆو پارامیتر گەلی ئابورێ، تەکنیکی، رامیاری، کۆرو کۆمە ڵگا ناسانەوە...» دابنێن، هەرچەندە هەندێ لە کۆزانی «حەوزەکانی» کۆروکۆمەڵگا ناسی لەگەڵ ئەمەدا مووافیق نین، لەتێ روانی زۆر بەی «کۆمەڵگاناسی زانین» فەرهەنگ بە ناوی رۆح و گیانی شارستانیەت و ژیانی کۆمە لاْیەتی «کورۆ کۆبونە وەکان بەواتای پەرەداری ئەوە، بە جۆرێ تایبەت بە تابیع لەگورانە کانی تەکنیکی، رامیاری، بە تایبەت ئابوری دائەنرێ و ئەم ژێرو رو کردنە لەگۆرانی بەرەی مرۆفی تازە و زاڵبونی لایەنی نەفسانی و ئەنبوژانی مرۆف بە سە رژیانی ئەودا سەر چاوەی گرتوە.

## ئە وین‌ورە حمەت:

بەهاری ئازادی کەژی شادیە، دەنگی پێی ئاشنایەدێ، دڵی گەرمی یارەدێ، لەگەڵ نە ورۆزی پیرۆزە، بە لْکو خودی بەهارە، سەوزترو شادتر لەبەهار، پێی لە نێو ئاوزەنگی عەشق داناوە، گوڵواژەی شادی و پاکی و بێخەشی و کەژی ئاشتی و دۆستی و تازە

بونەوەی سالْ و دلْ و دەرونە دێ، ژیان وژین، محەبەت و ئەویندارى، دیندارى، و شیارى و راستی و سەر راستی و رۆژی لێبوردن و دەسپ لەملانە دێ، هەمو پێ قەرزدارین: لەچەمەنی دلْ و دەروندا لەخشەخشی ئاونگ و شەونم، غەزەل و هۆنەی بون و سترانی شادی ئەگاتە گۆی و دلْ و دەرون دەلاوێنێتەوە! هەمو لەحالێ پاک کردنەوەی دلْ و دەرونی خانوچکەی ژیاندان، فەرش و قالْیچەی زێرینی دلْیان لەژێر پێ دۆست را خستوە، تا ئیتر یەک بین ویەک گرین و بە سەر دێو و درنجی دژو دوژمناندا سەرکەوین، خونچەکان، لەکاتی پشکوتن و دەم کردنەوەدان، ئەو هاتوەوبونێ خۆشیگولْ و رێحانەی شەرمە سار کردوەو گوڵە نە سرین و وەنەوشەی سەر شۆر و کەزێم شۆرکردوە، بەهار لەتەک ئەودا، بەودا، ئەو لەبەهاردا بەهاری بە هاران بەهات هاتەوە، سەرما لاچو، زوقم نەما، سیخوار تواوەو کراسی سپی لەبەر زەوی دارِندرا، گیاو گولْ بوژاوە، رِوحی مردو گەشاوە، ئەوەسفرەی پان کراوەی خوایە، هەمو سەرچۆپیان گرتوە و بە شایی وهەلْ پەرکێ و دەم بەبزەو پێکەنین لەبەزمی خوادا غەزەلسوراییی ژوانی دلْبەرن: ئەوینی خواورە حمەتی باریە، مانگی میوانداری، دۆستە، نیایشتگەی بێدار دلانە، بەڵێ! رەمەزان لەگەلْ ئەومە کە (ر) کەی نیشانەی رەحمەتە «م» ەکەی مەو هەبەتە (ض) ضیافەت و نیشانەی میوانداری خوایە «ئەلف» کەی ئەنواری حەقە«ن» کەی نیایشە،رەمەزان، مانگی بەرەکەتە، مانگی حەرەکەتە بۆئازادی و بە دەس هێنانی سەفا و شادی، مانگی صەلابەتە، مانگی تیلاوەتە و بەهاری قورئانە سەید و سەروەری، زەمانە، کوری رەجەبە، رەجەبێ کە پێغەمبەر لەودا چوە میعراج، بەلای منەوە یەکێ لەهوێ دەرکی واتای حیکمەت هەرئەمەیە چونکا میعراج تەنیا یەک روداونیە، میعراج ئەوەیە، کە پێغەمبەر تا سەر سەرەوە ئەروا وخوا ئەبینێ یانی هەرکەس ئەبێ برواتە میعراج، ئەمە زەریای وەحیە، بۆ پێغەمبەر، ئەوە دەریایە، ئێمەیش بەرەی مرۆف ئەبێ برۆین لەو دەریایە داکاسە و گلْینەی خۆمان پروتەژی بکەین و رۆح وگیانی خۆمانی پێ تیراویکەین، تۆ کە لەماوەی ژیانتدا تونی ئاوی ژیان بوی و بەدو ی دۆزینەوەی رازی بەقا، بۆ لە قابوی، تۆکە تینوی گیرهاتن بوی وهەر وەک ئاسکی سلْ و مامزو کە ژالْ وخەزالْی حەیران لە هەردی ئاوارەیی دا، بەدوی کانیاوێک و سیبە رێکدا لە سێبە ری‌دارێک دەگەرای، تا رۆحی ماندو و بێقە را ری

خۆتی تێدا بشۆی ولەشی شەکەتت لەبن سێبەری ئەوداره بحەهێنیتەوەو دەمێ ئارام بگری و جۆرێ ئاوی مەعنەوی بنوشی وتینویە تیت بشکێ، ئێستا رەمەزان و بەهار بەهات هاتون تاگەلأرێزانی مردوی، دڵت ببوژێنێتەوە، وەکو مێرگ و مێر خوزاری بەهاری، شاد و پاراوی بکەی ولەبەر سەوزی و جوانی هەرگەشەو و نەشەی بێ و ئاوەنیای دڵت وەکو گەنمی دێکۆن هەڵدا وقەف هەڵچێ بەدەم ئاسماندا و لەئاسمانی مەعریفتدا بەدەم باوە شنەی بێ، رەمەزان کانیاوی زولاڵە، سێبەری شۆرەبیە، ئارام بە خشی دڵە،رەمەزان دار ێکی پڕ میوەیە «نَخلِ پرثَمَر» مائدەی ئاسمانیە میوانداری ئەشق و ئەوینی مەلەکوتیە، تۆیش تونی بێقەراری صەفای، رۆحی خۆت تێرا و بکە، خۆت بنا سە تاخودای خۆت بەباشی بناسی.

خۆت بناسە تا خوای خۆت بناسی ولەبەندی «خۆت» رزگار بی و بگەیتە خوا «بون» بناسە تا «رازی ئافە رینش» بدۆزیتەوە.

تۆئێستا وای لەکۆی؟ جیهان و جێگات لەپان و.بە رینایی خلیقەتدا واله کوێی؟ بۆهاتگی؟ لەکۆی وەهاتوی و بۆکۆی دەچی؟ ئەم غەفلەتە لەچیە؟ دڵە بەردینەی ئێمە بوچ لەئەشق و ئەوین خاڵیە،رەمەزان شەوی «قەدر»ە و پارشێوی پارانە وەیە،حەیفە، زۆر حەیف و مخابنە ئەگەر لە «شەوی قەدر» دا قەدر وریزِ خۆمان نەزانین!

راستی تاکۆی برِئەکەی، هەڵفری؟ باڵ و پەری هەڵفرین بوکام ئاسۆ، بۆکامە مەقسەد و بۆ کێهە لاوە ئا واڵە دەکەی ولەشەقەی باڵ ئەدەی؟ ئایا خۆت ناسێگە تابزانی بۆچ کارێکی؟ کیێ و چی ولەکۆێ ولەکوێوە هاتگی؟ بۆ بەقای یا بۆ فەنای بۆ پەروان و سوانی یا بۆمانی، و بۆ نەفە و تانی؟ بۆ بەرز بونەوەی یا بۆ نزم بونەوە، بۆمانی یا بۆ چون وتیا چونی، بۆسعودی یا بۆ هوبوتی؟ ئایا بیرت کردۆتە وەو زانیوتە، کە چ کارێک لە لە جەنزاری، بۆگەنی خۆیین «خۆ، خوازی» دا و بەعەتری «خواناسیت» ناسیا و دەکا؟ کام کردەوە، باڵ و پەرت بۆ، هەڵفرین، بۆ ئاسۆی بە ختەوەری و بەهەشت ئامادە ئەکا، کێهە سفەت و خو وئاکاری رەسەن و قەلادەی راکێشان بەرەو بێ بەختی و دۆزەخ دەکەوێتە گەردنت و بۆلای دەردو ئازار، رات دەکێشێ؟

رێگای هەڵدان و پاکبونە وەو هۆی «رزگاری» و هۆی «تاوان» دەزانی؟ لەتەک

«نەفسی ئەمارە» و مەیدانی کردە وەو زەمینەی تەلاشی ئەو و بە هوێ ئیغوا کـردنیشی ناسیا و کریاوی تا لەو مەیدانەدا، بتوانی بیکوتی بەئەرزاو بە شێوەی «جیهادی ئەکبەر» تخێڵی بکەی ئایا دنیای «تۆ دەرتۆ» سەمەرەی «دڵ»تی کوشتوە؟ ئایا ؛نە فسی» هـەزار رەنگت ناسیوە، تا بەهەر روپۆشێ کەئەی دا بەسەر نە فسانیەتدا بی ناسییەوە و لەهەر کوێ زەهری رژاند بە پاد زەهر کە لَک وەربگری و بەری ئێش وئازاری بگری؟ رەمەزان بۆسلوکی ئەو کارەیە، بۆ «کۆچ کردنی دەرونیە» و بۆسەیرە لەدنیای باتندا! بۆپیاچونەوە، بەکردەوەی نەفسانی و خوونائاکاریە بۆ ئەوەیە کە «مەلەکەی نە فسانی»» و با یەخەکانی بەرز لەنێو دڵ و لە قولأیی گیانی خۆتا پەر وەردە، بکەیت و باش باری بهێنی و خۆت لە خۆرسکی سروشتی نێزیک بکە یتەوە.

کە وشەنی دڵیش بە دەس خۆتە ئەتوانی ببیتە «مەهبەتی‌نور» یا جێگای داو، نانەوەی «جاڵجاڵوکەی شەیتان» دیاری کردنی ئەمەش بەدەس خۆتە.

ئەگەر دڵت خستەبەر دەستی کارو کردەوەی چاک، ئەگەر شەوقت بۆ چاکە، تەقوا و ئەشق، بـە «خـوا»ت «لە دڵ ودەرونـدا رونـاک هـەڵ گیرسـاند، ئەوسـا «حەسەنـات» و «صالحات» دەیێتە کانیەک کە زولاڵی لەنێو دڵ و دە رونت‌دا، تافگە ئەکاو بە قەڵبەزە و خور دێتە دەرێ و گشت‌گیان ولەشت دەگرێتە وەو هـەموی دەشـوا و پـاک و بـێخەوش رای دەگرێ و لە ناخی دڵ و دە رونت‌دا شوێن دائەنێ و هەمو کارو ئاکارت باری مەعنەوی و ئیلاهی پەیدا ئەکا و رەنگی بێ رەنگی خوا ئەداتەوە، ئـەمەیە، مـیوەی تـەزکیە و خـو و ئەخلاقی چاک کە رەمەزان ئەتوانێ بەدی بهێنێ.

تۆ ئەگەر بۆ پێگەیشتن و تێگەیشتنی خۆت دڵت ئەسوتێ، رەمەزان و بەهاری ئازادی بگرە بەرچا و تۆی کەئەتوانی دیمەنی خۆت بە «ئارایش» یـا «ئـالایش» جـوان یـا دزیـو بکەی، خۆین شیرین بی‌یا خۆین تاڵ، شەکر بی‌یاکەکرە، چاک بی‌یـاخراو، دلأوابـی یـا مست قوچا و، چاو پاکی بی یا چاو نە زێر، خودایی بی‌یاتاغوتی، هیودا دارین خوایی بین.

ئەم و تارانە لە رۆژنامەی شەهادەی کوردی بە قەڵەمی دشەپول، لە ژمارەکانی ٣٩٠ تا ٣٩٣ سالّی دەیەم سالّی ٢٦٤٠ کوردی و ١٩٩٢ زاینی لە چاپ دریاوە.

# تەلاشی مرۆڤ پڕو تەژی یە لەدەردو ڕنج..

**قسەکردن و لێکۆڵینەوە لەئایاتی ١ تا ١٩ سورەی ئینشیقاق:**

**باسێکی تەحقیقی کە لەروی بیرورای زانایان و مولەسیرانی گەورەی دنیای ئیسلام مان بۆئێوە هەڵ بژاردوە، وەکو بیرورای ئیمام فەخری رازی،قورتوبی و خاوەنی کە شاف، ئەلمنار روح المعالی جواهر یاتەنتاوی و بیرورای هەندی تر لەزانایان، لەبابەت واتای ئەم ئایەتانە کە خوا لە سورەی ئینشیقاق ئایەتی شەشەم دا فەرمویەتی:**

**يَا أَيُّهَا الإِنسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا. واتا: ئەی ئینسان، ئەی مرۆڤ بێ گومان تۆ بەتەلاش و تەقالادان وبەدەردورەنجەوە، بەرەولای پەروەردگارت دەرۆی و ئەو مولاقات ئەکەی ودەچی یە دیداری خوا.**

**خوا لەم ئایەتەدا ئینسان ئەکاتە موخاتەب و قسەی بۆدەکاو چارەنوسی کائینات وبەرەی مرۆڤی بۆ رون دەکاتەوە،کە ئینسان چ ڕێبازێکی هەیە وچ ڕێگاگەلێ دەبڕێ، بوێ بەیاندەکا وپێی دەفەرمێ: ئەی ئینسان ڕێگایەکی سەخت وپر لەبفە و تە ژی لە مەترسیت لەبەرە کە کەندو کوسێکی زیاد پر دەردو رەنجت لەپێشە تا دەگەیتە پەروەردگارت، کدح لەسەر وەزنی مدح بە واتای تەلاش و کۆشش و هەوڵ و تەقەلایە کە تێکەڵ بێ لەگەڵ دەردو رنج و ئازار و لەسەر گیان ولەش ولار و ڕۆح شوێن دا بنێ، جاهەر لەبەر ئەمەیە کە**

لەزمانی عەرەبیدا بەگای جوتی کە زۆر زەوی بکێڵی و زۆر ماندو بێ و بێ و چان کار بکاو ماندو بون لەئەندامی دا دەربکەویٚ پێی دەڵێن (ثورفیه کدوح) لەتەفسیری کە شاف و تەفسیری ئیمام فەخری رازی و لەتەفسیری روح‌المعانی دا هاتوە کە ئەم بیژە (ی کدح) لەئەصل و بنەرەت داجی چرنوکێکە، خەراشێکەکە دەکەوێتە سەرپێستی لەش یادەم و چاو، جا هەر لە بەر ئەمەیە بە کۆشش و تلاشێ کە شۆێن لەسەر رۆح و گیانی مرۆف، ئینسان دائەنێ بەکار ئەبرێ.

ئەم ئایەتە ئیشارە بەیەک ئەصلی بنەرەتی و ئەساسی لەژیانی هەمو ئینسانێکدا دەکا، کەهەمیشە ژیانی تێکلاوە، لەرەنج و دەرد و ئازار، بەکەندو کۆسبەوە دەژی، تەنانەت‌بۆ گەیشتن بە ژیانی دنیایش بێ جاچ جای ئەوە کە مەبەست وئامانج گەیشتن بە ئاخیرەت وبەختەوەری هەمیشەیی ونێزیکی و قوربی پەروەردگار بێ، ئەمە تەبیعەتی ژیانی دنیایە تەنانەت کەسانێکیش‌کە لەنیها یەت‌وئەو پەری خۆشی و ساماندارى‌دا دەژین، ناتوانن لە دەردو رنج‌و ئازار دورە پەرێز بن.

تەعبیر بە مولاقاتی پەروەردگار، خوا ناخوا، لێرەدا ئیشارە بەدیدارو مولاقاتی شانۆ و صەحنەی قیامەت‌و رۆژی بەرێ یە، کە صەحنەوشانۆی حاکمیەتی موتڵقەی خوایە، یا مولاقاتی جەزا و پاداش و سزا وکەیفەری خوا یا مولاقاتی خودی خوا، لە رێگای سودی باتنەوە، نیشان ئەدا، کەئەم رەنج و تەعەبە، تا ئەو رۆژەبەر دەوام ئەبێ، وەزەمانێ بەپایان دەگاو دوایی دێ، کە پڕوەندەی ئەم دنیایە، بەبەسترێ وئینسان بەعەمەل وکردەوەیێ چاک و پاک، خوای خۆی مولاقات ئەکاو ئەچێتە لیقائوڵلا.

خیتاب ورویِ‌قسە بۆ ئینسان، کە هەمو نەوعێ ئینسان دەگرێتەوە با تەوەجوە بە تەکیە، لەسەر ئینسانیەتی ئینسان، بەیان گەری ئەم راستی و حقیقەتەیە، کە خوا وزەی لازمی بۆ ئەم بزوتن و حەرەکەتە، بەردەوامە، ئیلاهی یە، لەوجودی ئەم ئەشرەفی مەخلوقاتەدا، خەڵق کردوە.

تەکیە لەسەر درۆشمی رب (پەروەردگار) ئیشارە بەمەیە کە ئەم کۆشش و تەلاشە جورنێکە لەبەرنامەی ربوبیەت و تەکامل و پێگەیشتن و تەربیەت وبا رهێنانی ئینسان.

بەڵێ ئێمە هەمو مانمیوا نێکین کە لەسەرسنوری عەدەم‌و نەبونەوە باری

سەفەرمان تێکناوە وپێمان ناوەتە ئیقلیم و ئاقاری وجودو بونەوە، ئێمە هەمو ڕێڕەوی مەنزڵی عەشق و ئەوێنی خودایین وئەمانەوێ، بەجەماڵی دیداری پڕ جەلالی ئەو بگەین و بەنوری جوانی تەجەلای خوا بگەین.

وێنەی ئەم تەعبیرانە لەئایاتێ تری قورئاندازۆردێنە بەرچاو کە لەسورەی (نجم) ئایەتی ۴۳ دافەرمویەتی (وان الی ربک المنتهی) دیارە هەمو کاروبار دەگە ڕێنەوە لای پەر وەردگارت وهەمو خەت ورێبا زێک بەخوا مونتەهی دەبێ، یاوە کو ئایەتی ۱۹ سورەی فاتر کە فەرمویەتی: والی الله المصیر) گەڕانەوەی هەمو بۆلای خوایە.

و چەندین ئایاتی تریش کە هەمو قسە لەمە، دەکەن کەئەم سەیری دائیمی تەکاملی موجوداتە، دەگە ڕێتەوە بۆلای پەردگاری خۆیان. بەهەر حاڵ مرۆڤ لەمەداری ئەصڵی ئافەرینشدا لەهەمان مەدارێک‌دا، کە خوا بۆ ئەم ئینسانە وهەروا دەسمایە و هێزو وزەیەک، کە خوابۆئەوی دیاری کردوە،بەپێ خیلقەتی خۆی پێی‌دائە روا،وەتەلاش و کۆششی مرۆڤ هەمیشە بۆ خوایە، تەقالا وحەرەکەتی، بۆلای خوایە، صیحەتی بڕواو ئیمان دەبێتە هۆی رزگاری ئینسان و لەلای خوا ئەبێتە هۆی سەر بەرزی مرۆڤ کەلای خوا رو سوربێ.

**دنیا خانوی دە ردوورەنجە** تە عبیر بەکادح لەم ئایەتەدا ئیشارە بەتە لاش و کۆششێکە، کە تێکلاو، بەرەنج و زەحمەت و ئازار بێ‌هەر وەکو لەپێشدا رامان گەیاند، باتەوەجوە بەمە، کە لەم ئایەتەدا روی قسەی خوا لەموتڵەقی ئینسانە و هەمو ئینسانێک دەکە وێتە بەرئەم قسە، ئەم راستی وحەقیقەتە، بۆئێمە دەر ئەخا کەتەبیعەتی ژیانی ئەم جیهانە، لەهیچ پایە وپلە یەکدا خاڵی لەکەندو کۆسپ‌نیە و ژیانی دنیا تەژی یە،لە رەنج و دەرد و ئازار، لەبابەت روح و گیان و فیکرەوە بێ‌بە ژان ترە یا دەرد و رەنجە، کە هەم گیانی و ڕۆحی و جیسمی بێ، کەس نی‌ دەردنیە، لەم دنیا یەدا.

دیارە مرۆڤی خواناس و خودایی قەت‌نابێ لەدنیادا خۆی توشی توشی دەردو رەنج بکا، لە بەر دنیا، بەڵکو ئەبێ دەردو رەنجی دنیا بۆ ئاخیرەت و بۆ خۆشی لای خوا بێ، دیارە سەیری تەکاملی ئینسان بۆلای پەر وەردگار، هەرگیزناتوانێ، بە مردن ڕاوەستێ و ژیانی دنیا لەوەکە مترە، کەئامانجێ ئاوەها سەیرو بزوتنە وەیەک‌بێ.

جادوای قسە و باسێ کە لەئایاتی بە رودا لە بابەت سەیری تەکاملی ئینسان،

بۆلای خوا زیکر کراوە بۆتەئکیدو دووپاتە کردنەوە لەسەر ئەم مەبەستە. و بەیانی ئەوە خوا دەفەرمێ (فلا اقسم بالشَفَقِ سوێند بەشەفەق والليل و ما وسق: سوێند بەشەو و ئەوەی کە کۆی دەکاتەوە ودای دەپوشی و سوێند بەمانگ و ئەودە مەی کەکامل دەبێ ودە بێتە بە درو مانگی چاردە (و القمرا ذا استق) کەهەمو ئێوە ئەی ئینسان هەمیشە لە حالیکەوە دەچنە حالی‌تر (لترکبن طبقا عن طبق) لا-لە ( فلا اقسم) دازایدە و بۆ تەئکیدە، هەرچەند هەندێ لە زانایان لایان وایە (لا) بۆ نەفی‌یە، یانی سوێند ناخۆم لەبەر ئەوەی مەبەستە کە، هەیانەو حاجەتی بە سوێند نیە، یامە بەستە کە ئەونە گرینگە کە بۆسوێند خواردن نابی یا ئەوانەی کە سوێندیان پێ‌خوراوە ئەو نە گرینگن شیاو ئەوەیە، کە سوێندیان لەسەر نە خورێ بەلأم و اتای یەکەم کە (لا) زایدە و بۆتەئکید بێ‌لە هەموان باشترە. شفق: روناکی رۆژ، کە تێکەلْ، لەگەلْ تاریکی شەوە جا هەر لەبەر ئەمەیە، کەیێژەی اشفاق بەواتای توجە و عنایەتی، تێکەلْ بەترسە لەگەلْ تاریکی شەو جا لەبەر ئەمەیە، کەیێژەی اشفاق بەواتای توجە و عنایەتی تێکەلْ بەترسە بۆ وێنە هەرکاتێ مرۆڤێک ئۆگری کەسێ‌بێ، و لەهەمان حالْدا لەبابەت رودا وێکە وە لەبابەت ئەو مەترسی هەبێ بەم حالەتە دەلێن: إشفاق و بەو مرۆیەش، دەلێن مُشْفِقٌ: دلسوز بەلأم ئیمام فەخری رازی لای وایە یێژەی شفق لەئەصلْدا بەواتای رِقَت و (ناسکی) یە، جا هەر لەبەر ئەمە بەجلْکی ناسک دەلێن: شفق وەحالەتی شەفەقەت بەهەمان حالەتی ریقەتی قەلب دەوترێ بەلأم واتای یەکەم لەراست تردەچێ.

هەرجۆر بی، مەبەست لە (شـفقٌ) لێرەدا هەمان روناکی تێکەل بە تاریکی لەسەرەتای شەودایە جا لەبەر ئەوەی لە سەرەتای شەودا لەهەوەلەوە سوری یەکی‌کەم رەنگ‌لە ئاسۆی خۆرا واوە، پەیا ئەبی‌و، لەپاشان جێگاکەی سپی هەلْ دەگەرێ ئیختلاف هەیە کەئایا شەفەق بە سوری یەکە، دەلێن، باسپی یەتی‌یەکەیە.

مەشهور و مەعروف لەنێو زانایان و موفەسیرین و عولەمادا واتای ئەوەلە کەلە شیعری شاعێرانیشدا زۆر تەکیەی لەسەرکراوە جائەوە یە، کەپیرە مێردی رەحمەتی فەرمویەتی:

# شیعر

واڕۆژ هەڵات لەبەندەنی بەرزی وڵاتەوە

خوێنی شەهیدە، ڕەنگی شەفەق شەوق ئەداتەوە

زۆربەی شاعیران شەفەقیان، تەشبیه کردوە بە خوێنی شەهید، بەڵام هێندی واتای دوەمین یان پەسەند کردوە، کەزۆر دوروکزە، بەتایبەت ئەگەر ڕیشەی واژەیی ئەم یێژەی (شَفَق) بەرقت دابنێن، باش وایە هەمان سوری کەم ڕەنگ لەواتای شفق بگرین کەنوری ڕەقیقی ڕۆژە. هەرجۆر بێ لەبەر ئەوەی دەرکەوتنی شەفەق لەئاسو یخۆرهەڵاتەوە، لەیەک حاڵەتی تەحول وگۆڕینی قوڵ و بێ بن لەجیهاندا خەبەر ئەدا و ڕاگەیاندی پایانی ڕۆژ و سەرەتای شەوە، سەرە ڕای ئەمەش جیلوەو جوانی یەکی، تایبەتی هەیە لەهەمو گرینک‌تر، کاتی نوێژی شیوانە، خوا سوێندی بەشەفەق خواردوە (فلا اقسم بالشفق) تاهەموان وادار بەبیر کردنەوە، لەم پەدیدە جوانە ئاسمانی یەبکا.

بە لاَم سوێندِ بەشەو شوێنەو ارو رازی زۆرە، کە لەودا شار دراوە تەوە، هەروەکو خوا لەسورەی قصص ئایەتی ۷۱ فەرمویەتی (قُل اَرَاَیْتُم اَنْ جَعَلَ اللهُ عَلَیْکُمُ الَّیْلَ سَرْمَداً اِلیٰ یَومِ الْقِیامَةِ مَن اِلٰهٌ غیرُ اللّٰهُ یأتیکُمْ بِضیاءٍ اَفَلا تَسْمَعُونْ.)

# هۆنە و شیعر

تیرێژ کە بە ڕۆژو پێل بە دەریا دریا

لە ورۆژەوە گوڵ پێکەنی، بولبول گریا

خوانوسی لەچارەی ڕەشی ئێمەش بە شمان

ژینێکی هەژاری پڕلە خۆزیاو بریا

ئەمەیە دە وڵەتت ئەگەر مەردی

بێ ڕەجابی، لەجاهو نیعمەتی ناس

دەولـــە مـــەندی ئـــەوە نـــیەکەبەبـــار

هـــەڵ بـــژێری مەتـــاع و زەر بـــەتەبەق

دە ولە مەندی لەسەر حەدیسی صەحیح

نـــەفسی شـــاد و دڵـــی گوشـــادە بـــەحە ق

لەم ئایەتەدا لەنیعمەتی ضیاو نورو روناکی رۆژ قسە دەکا، کەمایەی هەر بزوتن وحەرەکەتێکە، لەپاشان لەئایەتی ٧٣ فەرمویەتی (**قُل اَرَاَيْتُم اَنْ جَعَلَ اللهُ عَلَيْكُم النَّهار سَرْمَداً اِلىٰ يَومِ الْقِيامةِ مَنْ اِلَه غَيْرُهُ يَأتيكُم بِلَيل تَسْكُنُونَ فِيهِ اَفَلاَ تُبْصِرُونَ**) قسە لەنیعمەتی شەو دەکاولە ئایەتی ٧٣ لەحەقیقەت دا نەتیژە گیری، دەکا کە لەلایەک رۆژ ی پێ داون بۆتە لاشی مەعاش و شەویشی داناوە، بۆ ئارامش و حەسانەوە کەدەفەرمێ (**وَ مِنْ رَحْمَتِهِ جَعَل لَكُمْ الَّيْل وَالنَّهارَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَ لِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونْ**.) رەحمەتی خوابۆئەمەیە، کەهەمو کەرستەی ژیان بۆ بەشەر دابین بکا، لەلایەک مرۆف نیازی بەکار و بزوتنەوە هەیە کەبێ روناکی رۆژ ناگونجێ و لە لایەکیش نیازی بەوچان و حەسانەوە هەیە کەبێ تاریکی شەو ناگونجێ. ئەمڕۆ لە روانگای زانستەوە سابت بوە کە لەراست نوردا تەواوی دەسگای بەدەنی ئینسان فەعال و سەر زیندو ئەبن گەڕانی خوێن، دام و دەزگای تەنەفوس، حەرەکەتی قەلب و باقی دەز گاکان، ئەگەر نور زیاد لەحەدِ خۆی روناکی بداتەوە سیلولەکان ماند دەبن، نیشاط، دەبێتە پەوان و سوان و بەراوەژو دام و دەزگای لەش لە تاریکی شەودا، دەحە سێنەوە وتەجدیدی قوا و نیشات دەکەن.

جالب و سەرنج راکێش ئەمەیە، کەکاتێ قسە لەشەو دەکا، لەئاخرە کەی دا دەفەرمێ: ئایا نابیسن و کاتێکیش قسە لەرۆژ دەکا دەفەرمێ: ئایانابینن، ئەم دو جۆرە تەعبیرەلەبەر ئەمەیە، حیسی مرتەناسب بۆشەو، گوێ یەو بیستن. وەبۆ رۆژیش چاو و بینایی یە.

وەلە سورەی یونس ئایەتی ٦٧ دافەر مویەتی (**هُوَالَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهارَ مُبْصِراً اِن فِى ذٰلِك لاٰيات لِقوم يَسْمَعُونْ**)

ئەم نیزامی نور و زوڵمەتە نیزامێکی پربەرە کەتە، حەسانەوە لەشەودا یەک واقیعیەتی

مەسەلەی عیلمی یە، کەپەردەی تاریکی شەو، نەتەنیا یەک هۆی ئیجباری یە بۆوچان دانی فە عالیەتی رۆژانە، بەڵکو شوێنی راستە و خۆی لەسەر زنجیرەی شادەمارکان و ئەعصاب و حە زولاتی مرۆف و گیان لەبەراندا هەیەو ئەوانە، دەباتە، حالەتی، حەسانەوە و خەو و بێ دەنگی بە لام وسق: یەکباری و شتر یاشەست صاع کەهەر صاعێ نێزیک بە سی کیلویە.

تەعبیر بە وَاللَّيْلِ وَمَا وَسَقَ بە سە رنج دان بەوە کە وسق: بە واتای کۆکردنەوەی پرش و بلاوی‌یە، ئەمە خۆی ئیشارە یە بەگە رانەوەی هەمو ئاژاڵ و پەلەوە رانە، تەنا نەت دیاردی یەبەئینسان، کەلەکاتی، شەودا، دەگەرێنەوە نێو خان و لانی تایبەت بەخۆیان، کەلەئاکام دا، ئەبێتەهۆی، ئاسایش و ئارامشی، هەمو گیان لەبەران وئەمە خۆی، یەکێکە، لەشوێنەوارە گرینگەکانی شەو، هەروە کوخوا، لەسورەی غافردا فەرمویەتی اَللّٰهُ الَّـذِي جَعَلَ لَكُمُ الَّيْلَ لِتَسْكُنُوْا فِيهِ: خوا زاتێکە کە شەوی بۆ ئێوە، خەلق، کرد، تا لەودا ئارام بگرن و بحە سینەوە لێرەوە روناک دە بێتەوە، کە تە عبیربە (إِذَا اتَّسَقَ) کە هەر لەو مادەیش بە واتای جەمع وجۆر بونە، لێرەدا بە واتای کە مالی نوری مانگە، لەشەوی چاردەدا و ئێمەدەزانین حالەت و جیلوەیەکی زۆر جوانی هەیە، کەسەرەنجی خەلک بۆلای خۆی رادە کێشی نورو فروغی ئەوە، سەرروی زەوی روناک دەکاتەوە، روناکی یەک، کەرەنگەو موزاحیمی ئارامشی بەشەوا نیە، لەهەمان حالدا رێگا بۆشەو رەوان دەکاتەوەو نیشانی ئەدا جاهەر لەبەر ئەمە نیشانەیە لەنیشانەکانی گەورەی خوا جاهەر لەبەرئەمەیشە سوێندی پێ خواردوە.

سەرەنج راکیشە هەر چوار مەبەستێ، کە لەم ئایەتانەدا سوێندی پێ خوراوە (وەکو: شەفەق، شەو، مەو جوداتێ، کە شەو، کۆیان دەکاتەوە ودایان دەپوشێ، مانگ لەحالەتی بەدەروچاردە دا) هەمو مەبەستگە لیکن پێکەوە مەربوتن و یەکترتەواو دەکەن و کۆری جوان و مونسە جیم، پێک دێنن، کە بیروئەندێشەی ئینسان دنەوقانە قدیلە ئەدەن، تالە قودرەتی گەورەی ئافەرینش بیربکەینە وەو لەم گۆرانانە پەی بە مە عاد و قودرەتی خوابەن یا بەین ئەم بە شانە ئیشارە بە حالات و گۆرانێکە، کەپەیتا پەیتا لەدنیای ئافەرینش روئەدا رۆژ سەردەکا پەبن تاریکیدا شەفەق کە بەقایایی سوری

ئەوەیە، دەردەکەوێ مەوجوداتی زیند و بەلەز ئەچنەوە نێولان وخانی تایبەت بەخۆیان مانگ ئەگەڕبوێتە، سێزدە و چواردە، هەڵدێ و دەردە کەوێ، ئەبێ بزانین کەمانگی شەوی چاردە لەسەرەتای هەلآ تندا خۆنیشان ئەداو ئەم سوێند دانە (وَالْقَمرِ اذااتسق..) بەرکوڵە بۆرستەی (لَتَرْكَبُنَّ طَبَقاً عنْ طَبَقْ) کە بەیان کارەوەی حالآتی جیا جیایە، کە مرۆف لە ڕێبازی ژیانی خۆیدا یەک لەدوای یەک پەیادەکا و بەدەسی دێنێ.

وە بۆ واتای ئەم ئایەتە تەفسیرو بەیانێ جور بە جوریان دە ربریوە:

١- مەبەست حالآتی جۆر بە جۆرێکە، کە مرۆف لەڕێگای پر دەردو رەنجی خۆی ڕێگا یەک بۆلای خوا و کە ماڵی موتلەق پەیابکا، لەئەوەڵە وەعالەمی دنیا لەپایاندا جیهانی بەرزەح وەلەئاخیری‌دا زیند و بونەوە و حالآتی جیاجیای ئەوە، ئەبێ بزانین کە طبق لەمادەی مطابقە بەواتای دانانی شتێکە لەبان شتێ ترو بەواتای مەنازلێکە، کەئینسان لەسەیری صوعودی خۆیدا تەی دەکا، بەو واتایەش بەکاربراوە.

٢- مەبەست حالآتێکە، کەئینسان لەسەر دەمی بونیەوە تاکاتی مەرگ، دەی برێ کە هەندێ ئە ویان تا ٣٧ حالەت ژمار دوە.

٣- مەبەست حالآتیکە، کە مرۆف لەژیانی دنیا لەسلآمەتی ر نەخۆشی خەفەت و شادی، سەختی وئاسایش، ئاشتی و جەنگ، بەشدار بوە.

٤- مەبەست حالآت و سەختی گەلێکی جیاجیایە کە ئینسان لەرۆژی قیامەت‌دا لەگەڵیدا رو بەرو دەبێ، تا لەحیساب فارغ دەبێ، هەرکەس بۆلای نەتیجەی کاری خۆی لەبەهەشت و دۆزە خدا بروا.

٥- مەبەست حالآتێکە، کە لەقوامی پێشین واقیع بوە یانی هەمان روداوەی تاڵ و شیرین، ئەنواعی ئینکارو بەدرۆخستنەوەی موخالیفان کە لەم ئومەتە واقع دەبێ، دیارە جە مع‌کردنە وەی ئەم تەفسیرانە مانیعێکی نیەو ئەشگونجێ ئایەتەکە بروانێتە هەمو ئەم گۆڕانانە کە مرۆف لەمەسیری ژیانی خویدا بەو شوێنەدا بروا.

هەندێ لایان وایە مرۆی ئەم ئایەتە (لَتَرْكَبُنَّ طَبَقاً عَنْ طَبَقْ) خودی پێغەمبەری مەزنی ئیسلامە و ئایاتەکە، ئیشارە بەئاسمانەکانە کە پێغەمبەر لەشەوی میعراج دا بەوانەدا رۆیشتوە بەلآم بەسەرنجدان بەوە کە (ب) لَتَرْكَبُنَّ بە ضمە و بۆردار دەخوێندریتە وە و

لَتَرْكَبُنَّ واتای کۆئەدا ئەم جۆرەتە فسیرە زۆر موتە ناسیب‌نیە، بەتایبەت کە مرۆی قسە لیکراو، لەئایەتە پێشوەکاندا هەموی ئینسان و (کل انسان) بووە.

هەر جۆر بیٚ حادیس بونی ئەم حاڵەتا ئەو رانەوە ستانی مرۆڤ لەسەر یەک حاڵەت، خۆی ئەبێتە بە ڵگەبۆ مەخلوق بونی مرۆڤ، وە نیاز بە خالق بونە، چونکا هەر متغیریٚ حادیسە و هەر حادیسکیش، خالقی دەویٚ، لەلایەکی دیکەوە، نیشانەیە کە لەسەر حەرەکەتی موستە میری مرۆڤ بۆ لای زاتی پەروەردگار و مەسەلەی مەعاد، هەروەکو لەم ئایەتەدا دیاردی بۆکراوە و ئێمەیش قسەمان لیٚ کرد ( **یا ایهاالانسان انک کادح الی ربک کدحا فملاقیه**).

بۆ وەبیر هێنانەوە، پێویستە بگەرێنەوە سەرئایاتی یەکەمی ئەم سورەتە کە دەفەرمیٚ (**اَذَالسَّمَاءُ انْشَقَّتْ**) اذا حرفی شەرتە و جزاکەی محذوفە و بە مجۆرەیە (**اذاالسماء انشقت .. لاقی‌الانسان ربه فحاسبه و جازاه**) لە وکاتەدا کە ئاسمان، اَجرامی ئاسمانی لەت لەت ئەبیٚ و نیزامی کەواکیب تێک ئەچیٚ تەفسیری **روح‌المعانی** لەج ۳۰ لاپەرەی ۸۷ دا قسەیەکی جوان دەگێرێتەوە، لەئاکامدا پەردە لە روی حەقیقەتێک لائەدا، ئەم ئایەتەشتیٚ نیشان ئەدا کە لەو رۆژگارەدا هیچ یەک لەزانایان پەیان بەوە نەبر دبو وئەویش ئەمەیە کە زانایانی عیلمی فەلەکی ئەمرۆ بەدیتنی ئەستێرە لەرێگای تلێسکۆبە گەورەکان و پرهێزەکان ئیسباتیان کردوە کە عالەم مەجموعەیە کە، لەکەهکەشان و هەرکاکێشانێکیش مەجموعەیەکە،لەمەنظومەو ئە ستێرەکان، جاهەر بەم دەلیلە بەوانە دەڵێن شاری ئەستێرە، یا شارە ستێر، کە هکەشانی رێگای شێری ناودار، کە بە چاو، قابیلی دێتنە مەجموعەیە کی گەورە و نمونەدایرە، هەر لەم مەنظومە و ئەستێرانەیە، لایەک لەوە، بەئەندازەیەک لە ئێمەدورە، کەئەستێرەکانی بەوێنەی هەوری سپی ئەبینین، بەڵام لەراستیدا مەجموعەی نوختە گەلێکی نورانی نێزیک بەیەکن، بەڵام لایەکەی دیکە کە نێزیک بە ئێمەیە،ئە ستێرەکانی دەبیندرێن وەهەر ئەم ستێرانەیە، کە ئێمە لەئاسمانی ئەودا ئەی بینین، بەم تەر تیبە، مەنظومەی خۆری ئێمە جوزوێکە، لە وکاکە شانە عەظیمە.

لە پاشان خوا لەئایەتی ۲۱ دا بە **ناوی نەتیژەگیری گشتی** لە ئایەتەکانی پێشو، دەڵی: (ئەی بۆچ ئەوانە برواناهێنن **فَمَالَهُمْ لاَ يُوءمِنُونْ**). باوەکو دەلایلی حەق روناک و

دیاره، هەم دەلایلی تەوحید و خواناسی وهەم بە لُگە ودەلایلی مەعاد، هەم ئـایاتی ئافاقی کە لەئافەرینشی هەوروباران، خۆرسک و سروشت،رۆژو مانگ و خـۆر و نـورو تاریکی و طلوع و غروبی رۆژ و خۆروشەفەق و تاریکی شەو، وە تەکامولی روناکی مانگ شاردراوە تەوە، . هەم ئایاتی ئەنفسی لەدە مێکەوە کە نوتفە لەبزدانی مـندال دان جـێ دەگرێ و پلە ی جۆر بە جۆری یەک لەدوای یەکی بڕیوە تاگەیشتۆتە ئەو پەری کە مالّی خۆی لەعالەمی جەنین دا، ئەوسا لەسەردە میلەدایک بون تـامەرگ، پـلەیێ تـردەپێون، جائابەم نیشانە روناکانەوە ئەی بۆچ بڕواناهێنن، لەپاشان لەکتێبی (تەکوینەوە، دەچـێتە سەرکتێبی) تەدوین دەفەرمێ،(وَإِذا قُرِىءَ عَلَيْهِمُ الْـقُرْآنُ لا يَسْـجُدُونْ) ئـایەتی ٢٢ - مەبەست لەسوجدە لێرەدا خضوع و تسلیم و ئیتاعەتە، و سوژدەی بە ناو بانگ، کە نـێو چاوان لەسەر ئەرزدائەنێ، یەکی لەمیصداقە کانی ئەم مفهومە کـۆنەیە، وەئـەم ئـایەتەیان کردۆتە بە لُگە بۆ ئیختیار، ئەبێ بزانین سوژدە بردن لە کاتی قورئان خوێـندا، بـێجگە لەچەن ئایەتێک نەواجبە و نەسونەت لێرەدا، بە واتای ئەسلیمە.

ئەم وتارە لە رۆژنامەی شـەهادەی کوردی سالی ١٣٦٩ی سالّی دەی ژمارەی ٣١۴ بە تاران بەقەلّەمی (شەپۆل) بلاّوبۆتەوە.

# ئایەتی نور

لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی ئایەی نور بەشێوەی لێکۆڵینەوەی زانستوڕافە کردنی ئایەتی نوربە شێوەی تەحقیقی و فەلسەفی و عیرفانی:

اَللهُ نُورُ السَّمٰواتِ وَ الاَرْضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكوٰةٍ فِيها مِصْباحٌ اَلْمِصْباحُ فِي زُجاجَةٍ اَلزُّجاجَةُ كَاَنَّها كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ يُوقَدُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لاشَرْقِيَّةٍ و لاغَرْبِيَّةٍ يَكادُزَيْتُها يُضِيءُ وَلَوْلَمْ تَمْسَسْهُ نارٌ نُورٌ عَلَىٰ نُورٍ يَهْدِى اللهُ لِنُورِهِ مَنْ يَشاءُ وَيَضْرِبُ اللهُ الاَمْثالَ لِلنّاسِ وَاللهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيم.

سورەی نور آیەتی ۳۵.

واتا: خوانوریئاسمان و زەوینە، مەسەلی نوریخوا وەکو چرادانێکە کەلە وا چرایەکی (پڕ نور) هەبێ. ئەو چرایەش لە ناو حوباێک (ڕوپۆشی چرا لە شو شە یا بلۆر) دابێ، حوبایێکی بێگەردو گرشەدار، وەکو ئەستێرەیەکی، ورشەدار، ئەوچرایە، بەرۆنێکرو ناک ئەبێ و گرئەگرێ کە لەدارەزە یتو نەیەکی پڕ پیت و بەرەکەت گیراوەکەنەخۆر هەڵاتی یەو نەخۆر ئاوایی رۆنەکە ئەوەنە پێنخۆش و پاڵاوتەو پاکە نێزیکە بێ ئەوەی ئاگری بگاتێ، گڕ بگرێو بایسێ. نو رلەسەر نورە (تیرێژ و تیشک بە سەر تیشکدا تیرێژ دەهاوێژێ).

هەر کەسێک خوا بیەوێ، بەرەو نو ریخۆی رێنوێنی و هیدا یەتی ئەکا خوا ئاگایلە هەمو شتێکهەیە.

(ئەم چرا پڕتیشکە) لەناو خانو بەرەکەلێک دایەکەخوائیجازەی داوە دیوارەکانیان، بەرزو بڵیند بکرێتەوە (تا دز و چەتەوجەردەپەی پی نەبات) فِي بيوتٍ أذِنَ اللهُ أنْ تُرْفَعَ وَ يُذْكَرَ فيها اسْمُهُ يُسَبِّحُ لَهُ فيها بِالْغُدُوِّ وَالآصالِ. «سورەی نور» خانو بەرەگەلێک کە ناوی خوا لە ناو ئەوانا ببرێ وە بەرەبەیان و لە ئێوارانا ناوی خوا بە پاکی ببەن.

لە راڤەکردنی ئایەتی نوردا قسە زۆرە تەفسیر نوسان، فەلاسیفە و خواناسانی جیهانی ئیسلامەتی و عاریفان و لێکۆڵەران، هەریەکە لەوانە قسەی جیاجیاوزۆریان هەیە، پێوەندکردنی، ئەم ئایەتانە لەگەڵ ئایەتەکانی بەرو لێرەوەیە کە لە ئایەتەکانی، بە رودا قسە لە پاک داوێنی و ململانێ کردنبو، لەگەڵ کاری ناحەز و ناشیا ودا لە رێگای جیاجیا وە، جا لە بەرئەوەی زامنی بەرێوە بردنی هەمر فەرمانەکانی، خوا، بە تایبەت غەریزەی نێرومێ کە بە هێزترینی ئەوا نەیە، بێ کەڵک وەرگرتن لە پشتیوانەی (ئیمان و بڕوا) تاگونجێ، سەرئەنجام قسەی هێناوەتەسەر باسی بڕواو ئیمان و شوێنیپرهێزی بڕوا و قسەی لێوەکردوە.

لە پلەی یەکەم دا فەرمویەتی: (خوانوری ئاسمان و زەو یيە (اللهُ نُورُ السَّمواتِ وَالأرْضِ) هەندێ لە تەفسیر نوسان پێژەی (نور) لێرەدا بە واتای (هیدایەت دەر) و هەندێتر بە واتای (روناکی هێنەر) و هەندێکی دیکەبەواتای (جوانی هێنەر) واتا کردوە، هەمو ئەمواتایانە راستە، بەلاّم واتای ئەو ئایەتە لەمەش پەرەدارترە.

لە قورئانا چەن شت بە نور واتا کراوە:

١ـ بە واتای (قورئان) وەکو خواله ئایەتی ١٥ی سورەی مائدەدا فەرمویەتی: (قد جائكم من اللهِ نورٌ وكتابٌ مبين) واتا: لەلایەنخواوە نور: (قورئان) و پەراوەیئاشکرایی دەر (بەخە لأت) بۆ تۆ هاتووە.

یاوەکو ئایەتی ١٥٧ سورەی ئەعراف کە خوا فەرمویەتی: (وَ اتَّبِعُوا النُّورَ الَّذِي اُنْزِلَ مَعَهُ اُولئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ) واتا: کە سانێ کەلەنو (قورئان) پەیرەوینەکەن کە بۆ پێغەمبەر هاتووە، ئەوانە رزرکان.

٢ـ بە واتای (بڕوا و ئیمان) هەر وەکو خواله سورەی بەقەرە ئایەتی ٢٥٧دا فەرمویەتی: (اللهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُماتِ إلَى النُّورِ) واتا: خوا وەلی

کەسانێکە، کە بڕواو ئیمانیان هێناوە، ئەوانە لە تاریکی (شیرک و کوفر) بەرە و نور (بڕوا) ئەبات.

٣ـ بە واتای (هیدایەتی ئیلاهی) و روناک بینیە هەروەکو خوا لە قورئانا لە سورەی ئەنعام ئایەتی ١٢٣ دا فەرمویەتی: **(اَوَمَنْ کانَ مَیْتاً فَاَحْیَیْنٰا وَجَعَلْنٰا لَه نُوراً یَمْشِی بِهِ فِی النّٰاسِ کَمَنْ مَثَلُهُ فِی الظُّلُمٰاتِ لَیْسَ بِخارِجٍ مِنها)** ئایا کەسیێ کە مردبوو ئێمە ئەومان زیندو کردەوە و نور (هیدایەت) و روناک بینیمان بۆ راگرت، تالەبەر تیشکی ئەو نورەدا بتوانێ بە نێو خەڵکا بڕوا، هەر وەکو کەسێکە، کە لە تاریکایی دابێ و هەرگیز نەتوانێ لەوە دەرکەوێ و بێتە دەرێ؟

٤ـ بە واتای (ئاینی ئیسلام)ە هەر وەکو خوا لەقورئانا لەسورەی تۆبە ئایەتی ٣٢ دا فەرمویەتی: **وَیَاْبَیٰ اَللهُ اِلاّٰ اَنْ یُتِّمَ نُورَهُ وَ لَوْ کَرِهَ الْکٰافِرُونَ)** واتا: خواخۆئەگرێ، مەگەر نور: (ئیسلام) کامڵ بکا هەر چەندە کافران پیان ناخۆش بێت.

٥ـ بە واتای: (زاتی پێغەمبەر)ە، هەر وەکو لە قورئانا لە سورەی ئەحزاب ئایەتی ٤٦داخوا سەبارەت بە پێغەمبەری مەزنی ئیسلام فەرمویەتی: **(وَداعِیاً اِلَی اللهِ بِاِذْنِهِ وَ سِراجاً مُنیراً)** واتا: ئێمە تۆمان کردە ئەوەکە خەڵک بۆ لای خواناسی بانگ بکەی و تۆمان کردە چرا یەکی، روناکی دەر.

٦ـ بە واتای (زانست و علیم)ە، هەروەکو ئەمە: **(اَلْعِلْمُ نُورٌ یَقْذِفُهُ اللهُ فِی قَلْبِ مَنْ یَشاءُ)** زانست نورێکە خوا ئەیخاتە ناو دڵو دەرونی هەرکەسێک کە بیەوێ.

**ئەبێ ئەمەش بزانین نور خوێئەم تایبەتیانەشی هەر هەیە:**

١ـ نور جوانترین و خوشیکترین و لەتیفترینی مەوجودات وبو نەوەرانە لە جیهانی ماددەوئەنبوژەنیدا و سەرچاوەی هەمو جوانی و خوشیکی یە.

٢ـ نور باڵاترین سورعەتی لە جیهانی ماددە و ئەنبۆژە نیدا هەیە، هەر وەکو لە نێو زانایاندا قسەی لێوە ئەکرێ، نور بە سورعەتی سێسەت هەزار کیلۆمێتر ئەتوانێ بە دەوری کورە:(گۆ) وجەغزی زەوی کەمتر لەچاولێکدا نانێکا حەوتجار سوربخوا جا هەر لە بەر ئەمەیەکە مەسافەتی دور و درێژ بە سورعەتی رۆیشتنی نور هەڵدەسەنگێنن واتا: مەودا و مەسافەتێک کە نور لە ماوەی ساڵێکدا، بە و سورعەتە زۆرە دەپێوێ.

٣- نور هۆی تێبیین و روناک کردنەوەی ئەجسام و دیتنی بونەوەرانی جیا جیای ئەم جیهانەیە و بێ نور مرۆڤ ناتوانێ هیچ شتێک ببینێ، کە وابێ نور هەم (دیارە) (ظاهر) و هەم (دیاری دەر) (مُظْهِرَ).

**٤- نوری خۆر کە گرینگترین و بەبایەخترین نورە لەم جیهانەدا و پەروەر دەری و گیا و گژە، بەڵکو رەمزی مانەوەی، هەمو بونەوەرانی زیندوە و نالۆێ بونەوە ری بێ کەڵک وەرگرتن لەنور: (راستەو خۆیا ناراستە و خۆ) زیندو بمێنی.**

**٥- ئەمرۆ جوان دەرکە و تووە کەئەو رەنگانەی و ائیمە دەیبینین لە سوێنگەی تیشک و شەوق و نور دانەوەی نورێکی دیکەی وەکو ئەمەیە، دەنا بونە وەران و مەوجودات لەتاریکایی دا رەنگیان نیە.**

**٦- هەمو وزەو ئەنیرژی یەک، کەلەژێنگەی ئێمە داهەیە (بێجگە لەوزە و ئەنیرژی ئەتۆمی) هەمولە نوری خۆرەوە سەر چاوە دەگرێ بزوتنەوە و حەرەکەتی باو بۆران، جم و جوڵی ئاوی زەریا و کەف و کوڵی دەریا و سێلاو، قەڵپەزەی ئاوی تاڤگەو رێژەوی باران و بزوتنەوە و هات و چۆی هەمو گیان لەبەران و بونەوەران، ئەگەر برێک سەرنج بدرێن رون دەبێتەوە کە سەر چاوەی هەموان لەنور دا دادەکوژێ**

**سەر چاوە و بناوانی گە رما و ئەوەی و اجێگاو رێگای بونەوەران گەرم رادەگرێ هەر نور و تیشکی خۆرە، تەنانەت گەرمای ئاگریش کەلە و شکەڵە دار، یا لە رەژی (زوغاڵ)ی بەرد یا لەنەوت، وەیا لەوانەی و الەنەوت بەدەس دێن هەمویان لە گەرمای خۆرەتاوی خۆرە. چونکا هەمو ئەمانە، بە پێی لێکۆڵینەوەی زانستی، ئەچنەوە سەرگژ و گیاو ئاژاڵ گە لێک کە گەرمایان لە خۆر، وەرگرتووە و لەناو خۆیانا ئازوخەیان کردوە کە وابو حەرەکەتی مۆتۆر گەلیش لەبەرەکەتی خۆرەوەیە.**

**٧- ئاوی خۆر هەمو جۆرە (میکرۆبێک) و بونەوە رانێکی ئازادەر لەناو دەباو دەیان کوژی دیارە ئەگەر ئاوی تیشک و تیرێژی ئەم (خۆرەتاوە): نورە پر بەرەکەتە نەبوایێ، ئەم ئاخ و زەویەیەوا ئێمەی لەسەر دەژین ئەبووە (بێمارستان) و نەخۆشخانەیەکی گەورە وزل کەهەمو دانیشتوانی لەگەڵ مەرگدا دەبوپەنجە شکێنێ بکەن.**

**بە کورتی بڵێین: هەر چی لەم بە دیها توە سەمەرەی جیهانی ئافەرینشە: (نور) ورد**

بینەوە، شوێنەوار و ئاسەواری بە نرخ و تەژی لەخێر و بەرەکەتی ئەم نورە ئاشکراتر و دیارتر دەبێ.

ئێستا بەلەبەر چاوگرتنی ئەم دو بەرکوڵە ئەگەر بمانەوێ بۆزاتی پاکی خوا وێنە و نوێنەرێک لە بونەوەرانی حیسّی ئەم جیهانە بگرینە بەر چاو (هەر چەند پلە و پایەی بەرزی خوا لەهەر وێنەو نوێنەرێک بەرزتر و تەرزترە) ئایا بێجگە لە بێژەی (نور) شتێکی‌تر هەیە بۆ خوا بەکاربێت؟! ئەو خودایەی واهەمو ئەم جیهانەی بەدی هێناوەو سازی داوە ئەو خودایەی وا نور و روناکایی بە جیهانی ئافەرینش داوە،کە هەمو بونەوە رانی زیندو لەبەر بەرەکەنی فەرمانی ئەو زەق و زیندو ماون خوێن و ژین لەناو دڵ و دەرو نیاندا گیر ساوەو بووژاوە و هەموئافەریدەیەک لەسەر سفرەی ئەو بەرێ ئەچن ئەخۆن و ئەژین کەئەگەر قەنەکێشێک چاوی لوتفی خۆی لەسەر ئەوان لابا هەمو لەشەوە زەنگیٚ فەناو نەمانا رۆدەچنە خوارێ و نوقم دەبن و وەکو بلّقی سەرئاو دەپوچێنەوە سەرنج راکێشە هەر بونە وەرێک بە هەر ئەندازەیەک لەگەڵ خوا پێوەندی هەبێ هەر بەورادەش نورانی بون و روناکی بەدەس دەهێنێ.

قورئان نورە چونکا کە لامو قسەی خودایە.

ئایینی ئیسلام نورە، چونکا رەوانەکراوی خودان.

پیرانی دەسگیر و زانایانی دینی نورن، چونکا پارێزەرانی ئایینی خودان لەدوای پێغەمبەران.

بڕوا: (ئیمان) نورە چونکا نیشانەی پێوەندی مرۆیە لەگەڵ خوای خۆیدا.

زانست (عیلم) نورە چونکا هۆی ناسیاوی و ئاشنا بون لەگەڵ خودایە.

کە وابو (اَللّٰه نوُرُالسَّمٰواتِ وَالْارضِ) لە بابەت زاتی خواوە دروستە، بەڵکوئەگەر نور بەواتای پەرەداری بێژەبەکار ببەن واتا: (هەر شتێک کە زاتی ئەو شتە دیارو ئاشکرابێ و دیاری دەرو ئاشکرا دەری شتانی تربێ) بەم جۆرە بەکار بردنی بێژەی (نور) بۆزاتی پاکی خوا لایەن و جەنبەی تەشبیهی و وێچوواندنی نابێ، چونکا هیچ شتێک لە جیهانی خلیقە تا لەخوا دیارتر و ئاشکراتر نییە، هەمو شتێک بێجگە لەزاتی خوا لەبەر بەرەکەتی وجودی خودا، ئاشکرایە و دیارە و لەچاو دەدا، کە وابێ هەمو شتێک و نوری هەبون

لەنوری خوا سەر چاوە دەگریّ لەو دەگو رویّو هەر لەنوری خودایشدا دەکوژێتەوە.

قورئان دوای دەربڕینی ئەم راستیەی والە بەرا و ترا بەهێنانە وەی میسالێکی جوان و ورد چلۆنایەتی نوری خوا لێرەدا دەردەخا و ئەفەرمێ: (نوری خوا وەکو چرا دانێکە کە چرایەکی تێدا بێ‌وئە و چرایەش لەناو حوبابێک دابێ حوبابێکی بێ گەرد و گرشەدار هەر وەکو ئەستێرەیەکی ورشەدار و ابێ (مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ الْمِصْبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ الزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ).

(ئەم چرایە بەرۆ نێک گڕ دەگریّ کە لەداری پرپەرەکەتی زەیتون گیرابێ کە نەخۆر هەلاّتی و نەخۆر ئاوایی بێت.)

«رۆنەکەی بە جۆرێکی وابێ گەرد و بێخەوش بێ وەک ئەوە بێ ئەوەی ئاگری بگاتێ گڕبگریّ و روناک هەڵگەڕیّ و هەڵکریّ.

(يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ) نورلە سەرنورە (نور على نور).

(خودا هەر کەسێک بیەویّ بەو نورەی خۆی رێگای نیشان دەدا و هیدایەتی دەکا و بەرە و نوری خۆی دەیهێنێ (يَهْدِي اللَّهُ لِنُورِهِ مَنْ يَشَاءُ)

(بۆخەڵک میسال و نەزیلە دەهێنێتەوە) )وَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ).

«و خودا بەهەمو شتێک ئاگادارە» (وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ) بۆشی کردنەوەی ئەم میسال و نەزیلەیە پێویستە چەندشت بزانین:

مِشکات بە واتای دەلاقە و تاقچەیە کە لەناو دیواردا سازیان دەکرد و (چرا و لامپا) کەیان لە ناودادەنا بۆئەوەی کە س خۆی لێ نەدا و نەکەویّ و نەشکیّ لەهەندیّ ماڵدا لە دیوی حەو شەو حەسارە وە شوشەیەکیان لەو جێکای چرای ناو دیوار دەگرت بۆئەوەی تیشکی چراکە دیوی حەوشە و دەرەوەش روناک بکاتەوە و چراکەش باو بۆرانی لێ نەکەویّ و نە شکیّ و نە کوژێتەوە.

(مشکاة) بە دیوارە شوشەیەکیش دەڵێن: کە درێژە و چارگۆشە بۆ جێگا چراکە سازدەکراو دەیان کرد بە سەر چراکەدا جالەبەر ئەوە هەڵمی چراکە دەرچێ و نەکوژێتەوە، لەسەروە کونێکیان بۆدە هێشتەوە و دەربیجەشیان بۆ سازدەکرد.

بەکورتی بڵێین: (مشکاة) روپوش یا دەلاقەیەک بو کە بۆچرایان سازدەکرد زیاتر

دەلاقەیان بۆسازدەکرد، تا چرا کە هەم لەشکان بپارێزرێ و هەمنورەکەشی کۆبێتەوە و باش‌تر نور بداتەوە و نا و هۆدەکە روناک بکاتەوە.

(زوجــاجە) واتـا: (شـوشە) و بـەبەردی ورشـەدار دەڵێن، چونکـا شـوشەش لەکەرەستەی بەردساز دەکرێ و ورشەدارە (زوجاجەی) پێ دەگوترێ.

لێـرەدا بـە واتـای حوبـاب و روپـۆشە دـە بـە سـەرچـرای دا هـە ڵدەکێشن، تـا هە مگرِوشوعلەی چراکە بپارێزرێ و هەم لەخوارەوە بۆ سـەرێ مـیزانـی بکـا و نـور و روناکایی زیاد و رێک و پێک بکا.

(یصباح) بە واتای (چرایە کە بەپلێتە و رۆن یا نەوت بگرِێ و روناکی بدات.

رستەی (یُوقَدُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ) ئیشارەت و ئاماژەکردنە بۆکەرەستەی ئەنێرژی زای گرینگ و شیاو، بۆئەو چرایـە، چونکـا (رۆنـی زەیـتون) کـە لەدارێکی: پرِ بەر و خودان بەرەکەت دەگـیردرێ، یـەکـێک لەبـاشـترین رۆنـە، بۆبـاش گرِگرتن، ئەویش دارێ، کە هەمو لایەکی ئەودارە بەجۆرێکی بەرانـبەر تـیشک و تـاوی خۆرە تاوی لێبکەوێ. نەلە لای خۆر هە لاتی باخ و کەناری دیوارێک بێت و نەلە لای خۆرئاوا بێت کە تەنیا لایەکی خۆر و تاوی لێبکەوێ و لەنەتیژەدا میوەی ئەودارە لایەکی بگا و نیوەکەی تریشی نەگا و رۆنەکەیش ناساف و خەوشدار بێ.

بەم شی کردنەوەیە دەگەینە ئەمە کە بۆ کەڵک و ەرگرتن لەنورێ تەواوی ئـاوەها چرایەک، بۆگرشەدانەوەی پتر نیازی بە چار شت هەیە:

١- چرا دانێک کە ئەو چرایە لەهەر بابەتێکە وە بپارێزێ. بێ ئەوەی نور و تیشکی کز بێ و کەم بکا بەڵکو هۆی کۆبەنەی پتری نورەکە یێک بێنێ.

٢- حوباب و روپۆشێکی هەبێ، تا گەرانی هەوای دەوری گرِ و شوعلەکە رێک بکا بەڵام ئەوەندە ورشەدار و بێ‌گەردبێ، کە نە بێتە هۆی بەرگری ورشەدار بونی نور و تیشکی چراکە.

٣- چرایەک هەبێ کە ناوەندی پەیدا بونی نور و تیشک‌لە سەری پلێتەکەوەبێ.

٤- کەرەستەی ئەنێرژی زای ساف و بێخەوش و بێ گەرد کە ئەوەندە ئـامادەی گرِگرتن بێ، کە بێ ئەوە ئاگری بگاتێ گرِ بگرێ و هە لایسـێ.

هەمو ئەمانە لەلایەک، لەراستیدا رواڵەت دەردەکەن و ئاشکرای دەکەن، لەلایەکی تریشەوە موفەسیران و لێکۆڵینەرانی مەزنی ئیسلامی، لەمەداکە ناوەرۆکی ئەمە تەشبیە و وێچوواندنە چی‌یەو بەناو (مُشَبَّة) کێهەنوری خودایی یە، قسە و لێکۆڵینەوەی جیا جیا زۆرە.

هەندی و تویانە مەبەست هەمان نوری رێنوێنی و هیدایەتە کە خواله ناو دڵ و دەرونی خودان بڕوایانداگیرساند و یەتێ.

هەندێکیش ئەوەیان بە واتای قورئان گرتووە کە لەناوناخی دڵی مرۆڤ نور و تیرێژە ئەهاوێژێ.

هەندێکیش ئەوەیان بە واتای قورئان گرتووە کە لەناوناخی دڵی مرۆڤ نور و تیرێژ ئەها وێژی.

هەندێکیش لایان وایە، ئیشارەتە بۆ رۆحی فەرمانبردن و قەقوا و خۆپاراستن کە هۆی خێر و بەختەوەری‌یە کە لەراستید هەموئەو واتایانەی بۆنوری مەعنەوی لەقورئان و ریوایەتی ئیسلامیداهاتون، لێرەدا بە ناوی تەفسیر و لێکۆڵینەوە ناو براون و رۆحی هەمو ئەوانە لەراستیدا یەک شتە و ئەویش هەمان نوری (هیدایەتە) کە لە قورئان و وەحی و وجودی پێغەمبەران سەرچاوەدەگرێ و بە لگەی تەوحید پاراو دەکرێ، و نەتیژەی ئەوە خۆبەدەسەوەدانە لەراست فەرمانی خوا و تەقوا دا.

دیارە: نوری بڕوا کە لەناو دڵ و دەرونی بروا داران (موئمینان) دا دارای هەمان چارشتەیە، کە لەیەک چرای «تیشک خۆشا» هەیە:

«مصباح» هەمان گڕی بڕوا و ئیمانە، کە لە دڵ و دەرونی خودان بڕوادا دەردەکەوێ و تیرێژ و نوری هیدایەت لەوەوە بلاو دەبێتەوە و پرشینگ دەها وێژێ.

(زجاجە) و حوباب دڵ و دە رونی خودان بڕوایە، کە بروالەگیان و لەشی‌دا رێک و پێک دەکا.

(میشکاة) سینگی خودان بڕوایە، یا بەواتایێ تر سەرجەمی کە سایەتی و ئاگاداری و زانست و بیر و ئەندێشەی ئەوە، کە بڕوا ئەو بروایە ئەو لەکەندو کۆسپی تۆفی روداوەی رۆژکار دەپارێزێ.

لاوته و عوسارەی ئەوە لە و پەری پاکی و بێخە و شیدایە و بڕوای خودان باوەران لەسۆنگەی ئەوە وەگڕ دەگرێ و لەبەر و بو تەژی دەبێ.

لەراستیدا ئەمە نوری خودایە، هەرئە و نورەیە کە ئاسمان وزەوی روناک کردوە تەوە و لەناخی دڵی خودان بڕوایان سەری دەرهێناوە و هەمو هەبون و کیان و لەشی ئەوان روناک و نورانی دەکا.

ئەو بەڵگانەی واله ئە قل و ئاوەزەوە، وەریان گرتووە لەگەڵ نوری وەحی تێکلاو دەبێ و ناوەرۆکی (نورعلی نور) پەیدا دەکا.

هەر لێرە شدا یەکە دڵ و دەرونی بێدار و هۆشیار بەم نورە، هیدایەت دەدرێن و واتای: (يَهْدِي اللَّهُ لِنُورِهِ مَنْ يَشَاءُ) لە بابەت ئەوانەوە پیادە دەکرێ، کە وابو بۆپاراستنی ئەم نورە خودایی یە: (نوری هیدایەت و بڕوا) کۆگایەکە لەزانست و ئاگاداری و خۆدروستکردن و ئاکاری پێویستە کە هەر وەکو میشکات و روپۆش و حوبابێک ئەم «میصباح» و چرایە دەپارێزێ.

دیارە دڵ و دەرونی ئامادە و شیاو و لێهاتوی ئەوێ کە هەر وەکو زوجاجەبە رنامەی ئەوە تەنزیم و رێک و پێک بکا و یارمەتی دەریشی لەلایەن وەحییەوە ئەوێ کە هەروە کوشەجەرەی موبارەکەی زەیتونە وزەو ئە نێرژی پێ بدا.

ئەم نوری وەحییە دەبێ لەتێکە ڵ بون و ئۆگر بون بەشت و مەکی ماددی و کەرونشکە کردن بەرەو لای خۆر هەلأت و خۆرئا واکە دەبێتە هۆی سووان و پووان و لێڵ و لێخناو بون، دورە پەرێز دەبێ.

بە جۆرێکی وا پاک و بێ گەردو بێخەوش و خاڵی لەهەر جۆرەگوڵەوە چنین بێ و بەم لاوئەولادا نەشەکێتەوە بێنیاز پەیدا کردن بەمو بەو هەمو هێزی لەش و لاری مرۆڤ دنەبدا، ناوە رۆکی: «يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَار» لەخۆیدا بەدی بهێنی.

هەر جۆرە راڤە کردن و شیکردنەوەی لەخۆوە یاداوەری ناراست و بەکار بردنی چێژە و سەلیقەی شەخسی و بڕوای داسە پێندراو یا شەکانەوە بەم لاو بەولادا مل و مۆکردن بە چەپ یا راستدا و هەر جۆرە بیر و باوەرێکی پوچەڵ و بێکاکلە کە بەر و

بوی ئەم شەجەرە: (دارە) موبارەک و پیرۆزە لەکەدار بکاگرٍ و نوری ئەم چرایە کەم‌دەکا، یا هۆی کوژانەوەی بەدەسی خۆی پێک دێنی.

ئەمەیە، وێنەیەک کەخوا لەم ئایەتەدا بۆنوری خۆی دەهێنێتەوە دیارە خوا بەسەر هەمو شتێکا زانا و ئاگادارە.

بەلأم ئەوەکە (مشکوة) بە دڵ و دەرونی پێغەمبەری مەزنی ئیسلام (مصباح) بەنوری زانست (زجاجە) بە دڵ و دەرونی پیاوی خودا (شەجەرەی موبارەکە( بە حەزرەتی ئیبراهیم و (لا شرقیە و لا غربیە) بە نەفی بەرە وکشان بۆ لای فەلەوجو لەکە واتا کراوە لەراستیدا دیمەنێکی ترلەو نور و بروایەنیشان دراوە، ئیتر وەنەبی‌قسە و لێکۆلینەوە هەر لە مەدا کورت کرابێتەوە و داکوژابێ.

ئێستا دەبێ بزانین ئەم چرا پڕنورە لەکوێ دایە؟ و جێگا کەی چلۆنە؟ تا ئەوەی والەم بابەتەوە پێویستە بە دیاری کردنی جێگاکەی باشتر روناک بێتەوە.

جا هەر لەبەر ئەمەیەلە ئایەتی دوای ئەمە خوا فەرمویەتی: «ئەم میشکاتەلە مالأنێک دایە کە خوائیجازەی داوە، کە دیوارە کانیان بەرز و بلّیند بکەنەوە (تالەتالأن و بروّی چەتەو جەردە و رێگر بپارێزرێن) (فِي بُيُوتٍ اَذِنَ اللّٰهُ اَنْ تُرْفَعْ). مالأنێک کە ناوی خودا لەناو یاندا ببرێ و بخوێندرێ و قسە و باس تەنیا یادی خوا و قورئان و پێغەمبەر و وەحی‌بێ.)

زۆر بەی زانایان و تەفسیر نوسانی قورئان پێوەندی ئەم ئایەتەیان بە ئایەتی بە روزانیوە و باری ئایەتەکەیان بەم جۆرەداناوە: ( هَذه اْلمِشْكوٰةُ في بُيُوتٍ ... يٰا هَذااْلمِصْبٰاحُ فِي بُيُوتٍ ... هٰذِهِ شَّجَرَةُاْلمُبٰارَكَةِ فِي بُيُوتٍ ... نوُر اللّٰه فِي بُيُوتٍ) زانایان و گیان ناسان و تویانە: لەم دارە پڕ بەرەکەتە کەناوی زەیتونە رۆنێک بە دەس دێ کە سودمەندترین و پڕبایەخترینی رۆنە وَ نەخشێکی زۆر گرینگی لەساغ و سلأمەت راگرتنی گیان و لەش و لاردا هەیە (ئیبنی عەباس) فەرمویەتی: ئەم داری زەیتونە کە هەموی بایەخدارە و سودمەندە، تەنانەت خوڵە مێشە کە یشی قازانجی هەیە یەکەم دارە کە دوای تۆفی حەزرەتی نوح رووا‌وە و پێغەمبەران لەبەر خوا پاڕاونەتەوە تا بەرەکەتی هەبێ.

ئەگەر پرسیار بکرێ مەبەست لەم (مالأنە= فی بیوت) چییە؟ کەهە ربەرە بەیان

وێوارانێک یادی خواله ناوئەوانا دەکرێ: (تەسبیحی خودایان تێدا دەکرێ))یُسَبِّحُ لَهُ فِيهٰا بِالْغُدُوِّ والْآصٰالْ) غدو له سەروەزنی (عُلُوِّ)ە، بە واتای: بەرەبەیان و سەرەتای رۆژە لەقورئانا لەراست (آصال) دانراوە، کەچی (غداة) لەراست (عَشِيِ) دایە.

(آصال) جەمی أُصُلْ له سه وەزنی: (رُسُلَ کە ئەمیش جەمی (اصیل) بە واتای (عەسر)ە بە لام‌بۆ چی (غدو) تاک و (آصال) بە جەم و کۆ هاتووە ئیمام فەخری‌رازی خودای لێ رازی بێ نوسیویەتی: (غدو) باری مەسدەری هەیە و مەسدەر هەرگیز جەم ناکرێتەوە.

مەردانێک که نه بازرگانی کردن ئەوانەله یادکردنی خوا و نوێژ کردن و زەکات دان‌دەگێریتەوە نه کرین‌و فرۆتن (رِجٰالٌ لاٰ تُلْهِيهِمْ تِجٰارَةٌ وَلاٰ بَيْعٌ عَنْ ذِكْرِاللّهِ وَ اِقٰامَ‌الصلو ةِ وايتاءَ الزَّكاةِ).

ئەوانه لەرۆژێک ئەترسن کە دڵ و دەرون و چاولەو رۆژەدا دەگۆرێن‌و، وەکو شەپلەلیانی دابێ و ایان لێدێ (يَخٰافُونَ یوماً تَتَقَلَّبُ فيهِالقلوبُ والابصار).

ئەم تایبەتیانە نیشان دەدا کە ئەم مالأنە هەرئەوا نەن وا بەفەرمانی خودا ساز دراون و یادی خوای مەزنیان تێدا دەکرێ و قسە و باسی خودا و قورئان و فەرمانەکانی ئیسلامی‌یان تێدا بلاو دەکرێتەوە وەکو مزگەوت و خانەقا و ماڵە پیا و چاکان و پیرانی دەستگیر.

بەڵێ: هەر شوێنێک کە بە فەرمانی خوا سازدرابێ و ناوی خودا لەویدا ببرێ، و هەربەرە بەیان وە ئیوارانێک مرۆڤ گەلێکی خودان بروا، کە ژیانی ماددی و ئەنبۆژەنی ئەوان لەیادی، خوا دورەوەنەخا و شەی پاک و خاوین بونی خوا بەدڵ و دەرون و زوان دویاتە بکەنەوە. ئاوەها خانو بەرە و مالأنێک ناوەندی (میشکاتی نوری ئیلاهی و بروا و هیدایەت و رێنوێنی یە).

**لەراستیدا ئەم جۆرە چەن تایبە تییەکیان بۆهەیە:**

**١- بەپێی فەرمانی خوا سازدرابێ.**

**٢- پایە و دیوارەکانی بە جۆرێکی وا بلێندوێتە و بێ‌کەلەتا لأن و برۆی چەتەو جەردە و دزبپارێزرێن.**

ژینگەی ژیانی بەخەڵکی روی زەوی تەنگ ئەکردو رێگای ژیانی ئەبەست (کەلەم بارەوە لەمەبەستێ ترازیاتر قسەتان بۆدەکەین).

خوا لەئایەتی ١٤ی ئەم سورەتەدا، دوابە دوای نیعمەتی نور یابە وتەی نوسەری کتێبی (لەدنیاکانی دورەوە) ئەگەر خەڵکی زەوی بیانەوێ نورێ، کە لەخۆر: شمس) وەری ئەگرن لەلامپاگە لێکەوە، وەری بگرن لەو شوێنەی واخۆرو شمس - یلێ یە، ئەبێ فابریقەو دام و دەزگایەک دامەزرێن کە بەژمارەی هەرتاکێک زیاتر لە (پێنج میلیون میلیارد لامپای سەت شەمعی) پێدا هەڵکرێن و بایسین.

هەروەها دوا بەدوای نیعمەتی نوروگەرما لەشتی زۆر بەکەڵتر وگرینگتر بۆ ژیان کە پێوەندی نێزیکی لەگەڵ نورو پرشینگی خۆر: (شمس) دا هەیە، قسەدەکا وفەرمویەتی وەئێمە: خوا لەهەورەبارا نزاکان ئاوێکمان باراندو نازڵمان کرد: **وَأَنْزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاءً ثَجَّاجًا**). معصرات ئیسمی فاعیلەو جەمی معصرە لە مادەی ((عصر)) بە واتای تەوژم وگوشینەکە ئیشارە بەهەوری بارانزایە، دەڵێی خۆی دەگوشێ تا ئاولەدەرونی بچۆرێ و بیارێ بەوتەی هەندێ لەزانایان هەور، لەکاتی کە لەکە بوندا سیستمێ بەسەر ئەواندا فەرمان دەکاکە خۆیان، دەگوشن و لەنەتیجەداباران دەبارێن و ئەم تەعبیرە لەراستیدا لەموعجیزاتی قورئان دیتە ژمارە (کتێبی باوبۆران) لاپەرەی ١٢٦).

هەندێ تر موعْصِرات بەواتای هەورگەلێ دەگرن کە ئامادەی باران باراندن بن، چونکا ئیسمی فاعیل جارجارە بەواتای ئامادە بون بۆ بەدی هێنانی شت بەکار دەبرێ.

هەندێتر و تریانە (مُعْصِراتْ) صیفەت نیە بۆ هەورەکان، بە ڵکو صیفەتە، بۆ (با) کەلەهەر لایەکەوە، هەورەکان دەگوشێ تا باران ببارێنن.

ثجاج لەمادەی (ثج) یە وبەواتای پەیتا پەیتا ئاو بەدەمو چاوداوان و زۆر و ز ەوەندە.

ئەبێ بزانین ثجاج صیغەی موبالەغەیە، زیادی و زۆر بونێ پتر دەگەینێ کە بەتێکرا واتاکەی بەمجۆرەیە: کەئێمە: (خوا) لەهەورە بارانزاکان ئاوێ زۆر و پەیتا پەیتامان باراندوەو ناردۆتە خوارێ؛ هەرچەند باران بارین ئەبێتە هۆی خێرو بەرەکەت هەوا ساف و بێخەوش دەکا، تۆز و خوڵ دەشوا تەوەو دنیا پاک و خاوین رائەگرێ پیسی رائەدا و

لەگەڵ خۆی ئەیبا گەرمای هەوا دائەمرکێنێ و تەنانەت سەرمایش تەعدیل ئەکا پەتا ونە خۆشی وناساغی کەم ئەکاتەوە بە مرۆڤ و ئەنزان رۆح،نیشات و شادی و دڵخۆشی ئەدا لەگەڵ هەمو ئەمانەش خوا لەچەند ئایەتێ ترا بەسێ فایدەی گرینگی تری باران ئیشارە دەکا ودەفەرمێ: مەبەست لە باراندنی باران ئەمەیە کە دانەی خۆراکی و گیایی و باغی پردار و درەختی میوەدار بە هوێی باران لەزەوی بڕوێ و هەڵدا، **لِنُخْرِجَ بِهِ حَبًّا وَ نَبَاتًا وَ جَنَّاتٍ أَلْفَافًا**: تاباغی پردارودرەختی پی رەعەمەل بێنین.

# فێرکردن و بارهێنانی بنەماڵە

بۆ فێرکردن و بارهێنان بۆ چاک بون و بۆ چاکی یا خوو ئەخلاقی و تەربیەتی بنەماڵە

خوا لەقورئان لەسورەی ئەحقاف ئایەتی ١٥ فەرمویەتی: **وَ وَصَّيْنَا الْاِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ اِحْسَانًا حَمَلَتْهُ اُمُّهُ كُرْهًا وَ وَضَعَتْهُ كُرْهًا وَ حَمْلُهُ وَ فِصَالُهُ ثَلٰثُونَ شَهْرًا حَتّٰى اِذَا بَلَغَ اَشُدَّهُ وَ بَلَغَ اَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ اَوْزِعْنِى اَنْ اَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِى اَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَ عَلٰى وَالِدَىَّ وَاَنْ اَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضٰيهُ وَ اَصْلِحْ لِى فِى ذُرِّيَّتِى اِنِّى تُبْتُ اِلَيْكَ وَ اِنِّى مِنَ الْمُسْلِمِينَ**)، یانیٛ: ئیٛمە، (خوا) بە ئینسانمان راگەیاند کە سەبارەت بە باوک وداکی خۆی چاک بیٛ و چاکەش بکا، دایکی کە بە زەحمەت و رەنج، ئەو هەڵدەگریٛ وە بەرەنجو دەردەوە دای ئەنیٛ و منالی ئەبیٛ، وەماوەو دەورانی زگ پڕی و لەشیر گرتنەوەی سی مانگ‌تا رۆژگاریٛ کە پیٛ‌ئەگاو هیٛزو روشت پەیائەکا. وەئەگا تەچل سالی ئەلیٛ: ئەی پەروەردگاری من! تەوفیقم بدە تا شوکر و سپاسی ئەو نیعمەتەت بکەم کە بە من و باوکم و دایکمت‌داوە وکاروکردوە یەکی چاک بکەم کە تۆپیٛ رازی بی ولەوەخوشنود بی وەزاروک و منالانی من چاک بکە (وچاکیان بارییٛنە) من بۆلای تۆ دەگەرێمەوەو تۆبەدەکەم و لەخۆ بەدەسەوەدەرانم.

نوکتە: ئەم ئایەتە دیمەنی مرۆڤیٛکی بڕواداروخوایی نیشان ئەداکە دوای پیٛگەیشتن و هەڵدانی لەش و لار، ئەگاتە پلەی پیٛگەشتنی ئەقلٛ (ئاوەز) ئەوسا ئەگاتە پلەی بەجیٛهیٛنانی شــوکرو سپــاس لەراست نـیعمەتی پەروەردگـاری خـۆی وشـوکردن لەراست دەردو

رەنجی باوک ودا یک کە ئەویان بەخێو کردوە و پەروەر دەیان کردوەو . گەیاندویانەتە ئەم شوێنە، کە بەخۆدا هاتوەو پێگەیوەوپێ ناوەتە سەرپێ پلیکانی مرۆڤایەتی و پیاوەتی، کە خەریکە خوێ بناسێ و لەگەڵ ئەوانەی وا سەروکاری لەگەڵ ئەو دا هەیە بیان بینێ و بیان ناسێ و لەکاتی خوێدا، لەخزان و هەڵخلیسکان تۆبە.بکا و کاروکردەوەی چاک و شیاو و خوا پەسەندانە ئەنجام بداو بۆفێکردن و با رهێنانی منداڵ، و زاروک بەرەو چاکەو چاک بون بکۆشێ و منداڵەکانی باش فێر بکاویاشیان باربهێنێ تارێگای چاکە و چاکەکردن و چاک بون بەرنەدەن و لەسەر ئەوەسورین چونکا ئەگەر خاوخێزان و منداڵی بنەماڵە، چاکبن و چاک پەروەردە بکرێن و چاکبار بهێنرێن، کۆمەڵ و جامیعەش چاک باردێن و چاک ئەبن چونکاکۆمەڵ وئیجتماعیش لەبنەماڵە ساز ئەبن، جا ئەگەر بنەماڵە و خاوخێران سالم و ساغ و پێخەوش بون،کۆمەڵ و جامیعەش، سالم و بێخەوش و ساغ و چاک ئەبن و باش باردێن و هەمیشە بە رێگای چاک دا ئەرۆن و بەتەرییەت ئەبن و سەرەنجام تەسلیمی فەرمانی خوا و پێغەمبەران ئەبن ولەبەرابنەری فەرمانی ئیلاهیدا سەر دەکەون و سەر دائەنەوێنن و هەر ئەمە خۆی ئەبێتە هوێ ئەمەکە لەرە حمەت و بەرەکەت و نیعمەتی زۆری خوادا غەرق بن و کەڵک وەربگرن، بە لێ، ئەمەیە نیشانەی مرۆڤی چاک و خودایی کە ئەتوانێ هەم بۆ خۆی و هەم بۆبنەماڵەو بۆخا و خێزانی بەکەڵک بێو قانزاجی هەبێ و هەروەها بۆئەوکۆمەڵ و جامیعەی کە تێیدا ئەژی بەکەڵک وموفید بێ.

٢- تەعبیر بە (وَصَّيْنا ٱلانسانَ) کە خوا فەرمویەتی: ئێمەبە ئینسانمان راگەیاند، ئیشارە بەمەیە کە مەسەلەی چاکە کردن لەگەڵ دایک و باوک و یەکێکە لە مەسەلەی چاکە کردن لەگەڵ دایک و باوک یەکێکە لەئوسولی ئینسانی و مرۆڤانی کە تەنات ئەوانەی وا پابەندی دین و مەزهە بیش‌نین بە پێی فیترەت و خۆرسک بەرەولای دەکشێن، جاکەوابێ ئەوانەی کە پشتی پێ‌لەم ئەرک و ئەسپاردە، ئەدەن نەک موسڵمانی بە راستی نین، ناوی ئینسانی و مرۆڤانیشیان بۆ شیا و نیەوناشێ پیان بگوترێ مرۆڤ یائینسان.

☐ تەعبیرو هێنانی (إحساناً) لەئایەتە کەدا (کەبەنەکیرەونەناسیاو، هاوتوەو لەو شوێنانەدا بۆ بەیانی عەزەمەتە) خۆی ئیشارە بەمەیەکە بەفەرمانی خوا ئەبێ لەبەرامبەری خزمەتەکانی دایک و باوکدا چاکەی چاک وگەورەوباش بکرێ و منداڵ لە خزمەتی باوک و دایکیدا بێ وفەرمانبە روگوێ رادێریان بێ.

□ شەرح دانی دەردو مەینەت و رەنجی دایک لەم ئایەتەدا کەدایک بۆ پەروەردە کردنی منداڵ و زاروک ئەو هەموەرەنجەی دیوە، هەر لەبەر ئەمەیە کە مەحسوستر و مەلموسترە، وەهەر لەبەر ئەوەیە کە دەردومەینەتی، دایک لەهی باوک زیاترو گرینگترە و هەرلەبەر ئەمەیشە پێغەمبەری مەزنی ئیسلام لەسەر چاکە کردن لەگەڵ دایک زۆرتر دوپاتەوتەئکیدی فەرموە هەر وەکو عەلاّمە ئالۆسی: لەتەفسیری روح‌المعانی دا لە ج ٢۶ لاپەرەی ١۶ دا لەفەرمودەیەکدا دەگێڕێتەوە و دەنوسێ:

پیاوێک هاتەلای پێغەمبەری خواو عەرزی کرد (من ابر؟ قال: امّک، قال ثم من؟ قال: امک، قال ثم من؟ قال: امک، قال ثم من) قال اباک یانێ: ئەی رەسولی خوا چاکە لەگەڵ کێدا بکەم؟ فەرموی: بەدایکت چاکەبکە، دوبارە عەرزی کرد دوای ئەم لەگەڵ چ کەسێکدا، چاکە بکەم، فەرموی: لەگەڵ دایکت؛ بۆجاری سێوەم عەرزی کرد، دوای ئەولەگەڵ کێ چاکە بکەم حەزرەت فەرموی: لەگەڵ دایکت، بۆجاری چوارەم کە پرسی یەوە، حەزرەت فەرموی: لەگەڵ باوکت چاک بەو چاکە بکە.

هەروا خاوەنی تەفسیری فی ظلال ج ٧ لاپەرەی ٤١٥ دەنوسێ: لەفەرمودەیەکدا، هاتوە: پیاوێک کە دایکی پیروکەم هێزبو، کردبویە، قەلاّندۆشی و حەج و توافی پێ‌دەکرد، لەو سەردەمەداگەیشتە خزمەتی پێغەمبەرو عەرزی کرد (هل ادیت حصتها) ئایاماف وحەقی دایکم بەمجۆرە ئەدا کردوە؟! حەزرەت لەوەلاّمدا فەرموی: (لا و لا بزفرة واحدة) نا تەنانەت نەفەسێکی ئەوت تۆڵەنەکردۆتەوە.

□ لەئایاتی قورئاندا گرینگی‌یەکی زۆر بە پێوەندی خاوخێزان و بنەماڵە دراوە، کەئەبێ رێز بۆ باوک ودایک دابنرێ و بە رێزەوە چاویان لێ بکرێ و هەروا قورئان زۆری سەرنجی پەروەردە کردن و فێر کردن و بارهێنانی منداڵ وزاروک داوە، کە دەبێ چاک بعا ملێندرێن و چاک فێر کرێن و چاک بار بهێندرێن کە وێنەی ئەوئایەتانەبون کە لەسەرە تاوە، قسەیان لێکراوە، دیارە ئەمە لەبەر ئەوەیە، کە کۆمەڵگا و جامیعەی گەورەی ئینسانی و مرۆڤانی بە چەن واحدی چکۆڵە چکۆڵە بە ناوی بنەما ڵەوخاوخێزان ساز ئەدرێ و ساز دراوە، هەروەکو، یەک خانوی گەورەکەلەداروبەردوخشت و گڵ و قوڕوپەردو هۆدەی بچوک و گەورەساز ئەدرێ.

دیاره هەرچی ئەم واحدە بچکۆلانەعال وسال و باش و چاک و خێرخواز و بەتەربیەت بن، بنەرەتی کۆمەڵگایش هەر بەو جۆرە دائەمەزرێ و پتەو؛ چاک و عال و سال دەبێ.

یەکێ لەهۆی ئالۆزاوی و شێواوی کۆرو کۆمەڵی جامیعەی سەنعەتی ئەم رۆژگارەی ئێمە تێک چون و شێواوی نیزا میبنەماڵە و خاوخێزانە کەنەلەلایەن زارو کەوە بۆ باب ودایک رێز و حورمەت ماوە و نەباوک ودایکیش ئەو مەحەبەتەی جا را نیان سەبارەت بەمنداڵە کانیان ماوەو نەپێوەندی دۆستی و خۆشەویستی و عاتیفە لەلایەن خاوخێزان سەبارەت بە ژن و مێردو تاکەتاکی بنەماڵەماوە،داری بە سەر بەردییەوە نەماوە کاریتە و دەسەکی قڕماوە و لاشیپانی شکاوە ئەوەیە رێزی کەس لای کەس نەماوە و میهرو وەفا تەنیا ناوی ماوەوباری واتای کڕاوەوسڕاوەتەوە.

روانگای دەردو رەنجاوەر، ئاسایشتگەی بە ساڵدا چووانە کە لەکۆمەڵگای سەنعەتی ئەمرۆدا بۆتە ناوەند بۆ باوک ودایکانی پیرو پەککەوتە کەلەسەر ماڵە ونێوخا و خێزاندا دەرکراون؛ ئەمە خۆی بە ڵگە یەکە بۆسە لماندنی ئەم حەقیقەتە تاڵ و تفتو ترشە کەمیهر و وەفاباری کردوەو نەماوە ئەنا چلۆن مرۆف ئیجازە ئەدا لەوتە مەنەدا باوک ودایکی لەخۆی دور بخاتەوە و بیان داتە دەست خانوی پیران یاناسایشتگای باوک ودایکی دوای ساڵەهای ساڵ خزمەت و مەینەتو پەروەردەکردنی منداڵ وزاروک و ئەسپاردنی ئەوانە بەکۆمەڵگای بەرەی مرۆف لە رۆژگارێکدا کەسەخت نیازی بەعوتوفەت و محەبەتی منداڵە کانی هەیە کەلەوتەمەنەدا دەستی بگرن و یارمەتی بدەن کەچی دورخرێنەوە و دەرکرێن و لەوێدا چاوە روانی مەرگبنوچا و ببڕنە دەروازە کە ناسیاوێک بێتەلایان و بیان لاونێتەوە،ئەویش خوا ئەزانێ لەساڵدا یەک دوجارێ ئەمە بێیانەبێ.

بە راستی بیر کردنەوە لەئاوەها ژیانێک بۆئیسنان هەر لەسەرە تاوە تاڵ وتفت و بێتامە ئەمەیە داب و دەستورو زاکۆنی دنیای مادی و موتەمەدین کە لەبڕوا و باوەروئەقیدە و دین و رێبازی ئاینی دور کەوتۆتەوە

□ رستە وئایەتی (أَنِ اعْمَلْ صالِحاً تَرْضاه) بە یانگەری ئەم واقیعیەتەیە کەکارو

کردەوەی باش و چاک، شتێکە ئەیێتە هۆی ڕەزا و خۆشنودی خوا جائەوەیە کەخوا فەرمویەتی (أُوْلَئِكَ الَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنْهُم أحسنُ مَا عَمِلُوا وَنَتجاوَزُ عَنْ سَيِّاتِهِمْ...) ئەوانە کەسانێکن کەئێمە: (خوا) باشترینی کاروکردەوەیان وەردەگرین وقەبوڵی دەکەین، وەلە تاوانیشیان ئەگوزەڕێن تەعبیر بە (أَحْسَنَ مَاعَمِلُوا) باشترین کارێ کە کردویانە کەلەئایاتی جیاجیادا لە قورئاندا هاتوە بە یانگەری فەزل و چاکەی بێ ئەژماری خوایە کەلەکاتی جەزاوپاداشی چاکەی بەندەکانی خۆیدا باشترین کردەوەی ئەوان دێنێتە ژمار بۆیان ئیمام فەخری ڕازی لەتەفسیری کە بیر دا فەرمویەتی: باوەکو خوا هەمو کاروکردەوەیەکی چاکەر ئەگرێ وقەبوڵی دەکا ئەی بۆچ فەرمویەتی (أَحسَن مَا عَمِلُوا: باشترین کاری ئەوانە قەبوڵ دەکا)؟! هەندێ لەموفەسیران لەوەڵامدا فەرمویانە: مەبەست لە (أحسَن مَا عَمِلُوا) واجبات و موستەجەباتە لەڕاست مەباح دا، کەکاری چاکە بە لام شتێک نیەکە قەبوڵ بکرێ و پاداشی بۆ دابنرێ.

لەبابەت ئەم بەشە لەوئایەتە دا کەفەرمویەتی: (وَحَمْلُهُ وَفِصالُه ثَلٰثُونَ شهراً) پرسیارێک دێتە گۆڕ کەخوا لەقورئاندا لەئایەتی ۲۳۳ سورەی بە قەرەدا دەورانی شیردان بە منداڵ بە دوساڵی تەواو: (۲۴ مانگ)ی داناوە کەفەرمویەتی (وَالْوالِداتُ يُرْضِعْنَ اولادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كامِلَينِ لِمَن ارادَ اَنْ يُتِمَّ اَلرِّضاعَةَ): دایکان دوساڵی تەواو شیر بەمنداڵە کانیان ئەدەن ئەوانەی کە بیانە وێ دەو ڕانی شیردان تەواو بکەن کەچی لەم ئایەتەدا دەورانی زگ پڕ بون و شیر بەمنداڵ دان تەنیا بە سی مانگ دانراوە مەگەر ئەگونجێ دەورانی زگ پڕ بون ۶ مانگ بێ؟

فوقەها و تە فسیر زانان بەئیلهام وەرگرتن لە فەرمودە، لەوەڵامدا ڕایان گەیاندوەو فەرمویانە: (بەڵێ لانی کەم دەورانی زگ پڕ بون ۶ مانگەو زۆربەی زەمانێ شیر بە منداڵدانیش ۲۴ مانگە تەنانەت کۆرێ لەپزیشکانی پێشو هەر وەکو (جالینوس و بوعەلی سینا) نەقڵ کراوە کەوتویانە: خۆمان بەچاوی خۆمان دیومانە کەدوای شەش مانگ منداڵ لەدایک بوە؛ لەزیمندا لەم تەعبیرەی قورئان دەر دەکەوێ کەهەرچی لەماوەی زگپڕبون کەم بێتەوە ماوەی شیر بە منداڵ دان زیاتر ئەبێ بە جۆرێ کە بە تێکرا بکەنە ۳۰ مانگ لە اِبْنْ عَبّاسْ نە قلْ کراوە کە هەر کاتێ ماوەی زگپڕ بونی ژن ۹ مانگ

بیٔەبیّ ۲۱ مانگ شیر بە منداڵ بدا و ئەگەر ۶ مانگ‌بیّ ئەبیّ ۲۴ مانگ شیر بە منداڵەکەی بدا.

قانون وزاکۆنی خۆرسک و تەبیعیش هەر ئەروانێتە ئەمە چونکا کەمبودی ماوەی زگ پڕبون ئەبیّ‌لە ماوەی شیردانەدا بۆ منداڵە کە پڕ بکرێتەوە.

لەپاشان دەفەرمیّ: ئیمانی مرۆف هەروا بەردەوام ئەروا تا دەگاتە کە ساڵ و ئەوپەری هێزی لەش ولاری‌خۆی و پیّ دەنێتە سنوروکەو شەنی چلّ ساڵی (حَتَّیٰ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً) هەندیّ لایان وایە (حَتَّی) لێرەدا بۆ غایەتە بۆ رستە یەکی قرتاو. وەبەم جۆرەیە (وعاشَ الانسانُ و استمرَّتْ حیاتُهُ حَتَّیٰ إِذا بَلَغَ أَشُدَّهُ) هەندێکیش لایان وایە (حَتَّیٰ) بۆ غایەتە بۆ (وَصَّيْنَا) یا بۆ مەسەلەی (چاوە دێری باوک ودایکە) بەڵام ئەم دوانەیان دورن چونکا راگەیاندنی خوا لەبابەت چاکە کردن بەدایک و باوک لەچلّ ساڵیدا دوایی دیّ و ئەوجۆرە چاوە دێری یەش تاچلّ ساڵ ناتوانیّ بەردەوام بیّ.

هەندیّ لەموفەسیران (بلوغ اشد: گەیشتن بە پلەی توانایی لەگەڵ گەیشتن بەچل ساڵی بەها ودەنگ دائەنێن و ئەڵێن: بۆتە ئکیدە بەڵام زاهیر ئەمەیە کە بلوغ اشد ـ دیار دەیە بۆ بلوغی جیسمانی و گەیشتنیش بە (اربعین سنةً: چل ساڵی) ئیشارە بەبلُغی فیکری و ئەقلانی بیّ چونکا دەڵێن: مرۆف لە چل ساڵیدا دەگاتە کەماڵ و ئەقڵی دەگا یاپیّ دەگا و هەر وەکو و تویانە: زۆربەی ئەنبیا لەچل ساڵیدا وەحی و سروشیان بۆهاتوە.لەزیمندا تەمەنی بلوغ و هیزی جیسمانی هەر ئەوەیە کە لەئایەتی ۳۴ سورەی ئیسرادایە کە فەرمویەتی: (وَلاْ تَقْرَبا مالَ الْيَتيم إلاْ بِالَّتي هِيَ احسنُ حَتَّیٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُ: ای قوتِهِ علی حِفْظِ المالِ و رشدِهِ فيهِ) کە لایان وایە: تەمەنی هەژدە ساڵی‌یە دیارە ئەوەکە ئەم تەعبیرە واتای جۆراو جۆری بۆ هەیە دژوارێک نیە چونکا بە قەرینە واتاکەی رون دەبێتەوەو بۆ مرۆف دەردەکەویّ.خوالەئاخری ئەم ئایەتەدا دەفەرمیّ: ئەم ئینسانە شیا و ودینداره کاتیّ دەگاتە چل ساڵی سیّ‌شتی لەخوا دەویّ:

☐ دەڵیّ: ئەی پەروەردگاری من: ئیلهامم پیّ بکەوتەوفیقم بدەتا شوکرو سپاسی ئەو نیعمەتا نەت بکەم کە بەمن و باوکمو دایکمت داوە(قالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ

**التِي اَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَ عَلىٰ وِالِدَيَّ ـ اَوْزِعْني** له **اِيزاعَ** و بەواتای ئیلهام کردن گەراندنەوە لەلاریٚ بەدی هێنانی عەشق وئەوین و ئۆگربون وتەوفیقە.

ئەم تەعبیرە نیشان ئەدا کە ئینسانی خاوەن بڕواو بە ئیمان لەتەمەنێکی ئاوادا هەم لەهولایی و پەرەدار بونی ئەو نیعمەتانەی کە باوک ودایک بۆیان کردوە تا کەیشتوتە ئەم تەمەنە تیٚ‌دەگا چونکا لەتەمە نێکی وادا خۆی دەبێتە باوک یا دەبێتەدایک جا بە چاکی لەچاکە و چاکە کردنی ئەوان دەگا و دەکەوێتە بیری ئەوان ولای خوا بۆیان دەپاڕێتەوە و شوکروسپاسی خوایش ئەکا.

دوەمین داخوازی ئەومرۆیە ئەوەیە کە دەڵیٚ: ئەی پەروەردگاری من! بە من تەوفیق بدە تا کاری چاک بکەم کارێک کە تویٚ پیٚ رازی بی **(وَ اَنِ اَعْمَلْ صالحاً تَرْضاهُ)** لەپلەی سێوەمدا لەبەرخوا دەپاڕێتەوەو دەڵیٚ: چاک بون و راستی و دروستی لەنێو زاروک و بنە ماڵەی مندا بەردەوام رابگرە **(وَ اَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَتِي)** هێنانی (لي: بۆمن) بۆئەمەیە کە چاکەوچاک بونی منداڵەکانی من جۆرێک بیٚ‌کەنەتیجەکەی بۆمن بیٚ وکە ڵکیان بۆ من بیٚ هێنانی **(فِي ذُرِّيَتِي)** بۆ ئەمەیە کە راستی و دروستی و چاکی و چاک بون لەتەواوی دودمانی ئەودا بەر دەوام بیٚ.

سە رنج راکێشە لەدوعا و پا را نەوەی یەکەمدا باوک ودایک ئەکاتەشەریک‌وها و بەش وەلەدوعا و پارانەوەی سێوە مدا منداڵ وزارۆکەکانی دەکاتە برابەش بەلاٌم لەدوعاوپارانەوەی دوەمدا هەر بۆ خۆی دەپاڕێتەوە بەم جۆرە مرۆفی چاک و باش کە ئەگەر بەچاوێک ئەروانێتە خۆی بە چاوەکەی تری، بۆ ئەوکەسانە ئەڕوانیٚ کە ماف وحەقیان بە سەر ئەو دا هەیە.

لە ئاخریدا ئەم دومەبەستە رادەگەینیٚ کەهەریەکە بەیانگەری یەک بەرنامەی عەمەلی شوٚێندارن و دەڵیٚ: «ئەی پەروەردگاری من: لەم تەمەنەدا دەگەڕێمەوەلای تو تۆبە دەکەم **(اِنِي تُبْتُ اِلَيْكَ)** گەیشتومەتە پلەیەک کە ئەبیٚ رێبازی من لەژیاندا دیاری بکریٚ وەتادواتەمەن درێژەی هەبیٚ بەڵیٚ گەیشتومەتە تەمەنی چل ساڵی بۆ یەکیٚ وەکو من چەن ناحەزو ناشیاوە کەنەگەرێمەوە لای تۆ و خۆم لەتاوان وگوناح بەئاوی تۆبە نەشۆم و خۆم پاک نەکەمەوە؛ لە پاشان دەڵیٚ: من لەخۆ بە دە سەوەدەرانم **(واني من المسلمين)**

له راستیدا ئەم دورستە پشتیوانەن بۆ ئەوسیٚ دوعاوپارانەوەو واتا کەشی ئەمەیە: چون من تۆبەم کردوە و لەراستە فەرمانی تۆدا خۆم داوە بە دە سەوە و تەسلیم بوم تۆیش گەورەیی بکەو بە رەحمەتی خۆت بمبە خشەو بمخەرە بەرناز و نیعمەت و بەرەکەت و رەحمەتی خۆت.

**ئەخلاق و تەربیەتی بنە ماڵە**: کردەوەی تاکەتاکی بنە ماڵە سەبارەت بەیەکتروریٚز دانان بۆباوک ودایک.

خۆینەرانی بەرز و بەریٚز لیٚرەدا ئەمانەویٚ هەندیٚ پیٚکەوە بڕوانینە **خو وئە خلاق و تەربیەت و بارهیٚنانی بنەما لە** لەروانگای قورئانەوە، تا با شتر لەم بابەتەوە بە رۆح وواتای قورئان ناسیا و بین و بزانین خوا مەبەستی ریٚزدانان بۆ باوک ودایک چلۆن مەترەح دەکاو دەی داتە بەر قسەو لیٚکۆڵینەوە و چلۆن دەیەویٚ بنە ماڵە خۆ بە خوو ئاکار جوان وخودایی برازیٚنیٚتەوە و چلۆن بار بیٚن و خو بدەنە خوی چاک و مرۆڤانی و شیا و تا لەکۆمەڵگای بەرەی مرۆڤدا بە رٚیز و چاک و سەرمەشق بن‌خوا فەرمویەتی **(لاٰتَجْعَلْ مَعَ اللّهِ اِلٰهًا آخرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُوماً مَخْذولاً** ـ سورەی ئیسرا ئایەتی ٢٢ـ واتا: لەگەڵ خوای‌تاق و تەنیا، خوایی‌تر دامەنیٚ وهاواری بۆ مەبە؛ دەناکز و بیٚ دە سە لاٚت و خوارو پە ست دەکەوی خوا دە یە ویٚ مرۆف تیٚ بگاو چاک باربیٚ و بیٚجگە لە خوای تاقانەو بیٚوٚینە هاوارو بانگ بۆکەسیٚتر نەباو هاوتا بۆخوا دانەنیٚ و بەندەگی تەنیا بۆ خوا بکا، هەروەکو فەرمویەتی: **(وَقَضیٰ رَبُّکَ اَلاّتَعْبُدُوا اِلاّ اِیّاهُ وَ بِالْوالِدَیْنِ اِحْساناً)** تا ئاخر ـ سورەی ئیسرا ئایەتی ٢٣ـ ئیٚمەلەواتای ئەم ئایەتەدا کە تەفسیری قورئان بە قورئان مان گرتۆتە بەرچا و ئەمانەویٚ باری لیٚکۆڵینەوە و ئەخلاق و ئامۆژگاری با رهیٚنان و تەربیەتی بنەماڵە و زانست و فیٚر بونی زانست و ریٚزدانان بۆ باوک ودایک و تەربیەتی زاروک لەلایەن باوک و دایکەوە لەم ئایە تەدا بخەینە بەرچا و هەروەک خوا لەم رستە کورتەدا کە فەرمویەتی **(وَ لاٰتَجْعَلْ مَعَ اللّهِ...)** دەردەکەویٚ کە شیرک سیٚ شوٚینی زۆر ناشرین و خراپ لەوجودی ئینساندا دائەنیٚ یەک شیرک هۆی پەستی و کز وکەنەفتی یە،چونکا بەهۆی شیرکەوە مرۆف لاڕیٚ ئە بیٚ و لەپشتیوانی خوا دور ئەکەوٚیتەوە و لەئەقڵ و ژیری لائەدا، دوەم شیرک هۆی **(فَتَقْعُدَ مَذْمُوماً مَخْذولاً)** بەدی دەهیٚنیٚ، سیٚوەم شیرک ئەبیٚتە هۆی ئەوە کە خوا پشتیوانی

نەکاو مەخذول بکەویٚ جا ئەوەیە کە خوا لەسورەی عنکبوت ئایەتی ٤١ لەبابەت ناشیاوی شیرکەوە فەرمویەتی: (**مَثَلُ الذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دوُنِ اللّهِ اَوْلِيٰاءَ كَمَثَلِ الْعَنْكَبُوتِ اَتَّخَذَتْ بَيْتًا وَ اِنَّ اَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنْكَبُوتِ لَوْ كٰانُوا يَعْلَمُونَ**).

جا خوا دوای ئەسلّی تەوحید وخوا بەیەک زانین بە یەکیٚ لەئەساسی‌ترین فیٚرکردن و تەعلیماتی ئینسانی ئەنبیا زیمنی تەئکیدی دوبارە لەسەر تەوحید، دەلیٚ: (**وَقَضىٰ رَبُّكَ اَلاّٰ تَعْبُدُوا اِلاّٰ اِيّٰاهُ وَ بِالْوٰالِدَيْنِ اِحْسٰانًا**) قەضا واتاکەی لە (ئەمر) موئەکەد ترە، قضا ئەمرو فەرمانی قەتعی و موحکەم و پتەوی بۆ هەیە.

قەرار دانی ئەسلّی تەوحید و خوا بەیەک زانین لە پالْ چاکە کردندا لەگەلْ باوک ودایک گرینگی ئەمە دەگەینیٚ کە ریٚزی باوک ودایک لای خودا بە ریٚزە.

موتلّەق بونی ئیحسان زۆریٚ لەکاری چاک و چاکە دەگریٚتەوە **والدين** کە دایک‌و باوکی موسلّمان و کافر دەگریٚتەوە، خۆی سیٚوەمین و چوارە مین تەئکیدی ئەم رستەیە نەکیرە بونی (اِحسان) بۆ بەیانی عەزەمەت و خۆی پیٚنجەمین تەئکیدە و نیشانەی فەساحەت و بەلاغەتی ئایەتەکەیە اِحسان ئەغلب بە (**الی متعد ی**) ئەبیٚ (احسن الیه...) و بە (ب) یش موتەعەدی ئەبیٚ کە بۆ موباشەرەیە واتا: ئەبیٚ محەبەت لەگەلْ دایک وباوکدا بیٚ واسیتەبیٚ و ئەمەش خۆی شەشەمین تەئکیدە لەم مەسەلەدا.

ئەسلەن فەرمان دەچیٚتە سەر ئەمر ـ ی ئیسباتی بەلاّم لیٚرەدا چوّتە سەر نەفی کە دەفە رمیٚ: (**وَقَضىٰ رَبُّكَ اَلاّٰ تَعْبُدُوا اِلاّٰ اِيّٰاهُ ...**) دەگونجیٚ لەبەر ئەمەبیٚ کە لەرستەی قضی فەهم دەکریٚ کە جوملەیەکی دیکە لەشکلْ و بیچمی ئیسباتی لە تەقدیر دابیٚ ولە مەعنادا ئاوا بیٚ: (پەروەردگارت فەرمانی موئەکەدی داوە کە پەرستشی ئەو بکەن و غەیری ئەو نەپەرستن و تەنیا خوا بپەرستین.

یائەوە کە مەجموعی رستەی (نەفی و ئیسبات:) **اَلاّٰ تَعْبُدُوا اِلاّٰ اِيّٰاهُ** لە حوکمی جوملە یەکی ئیسباتی دایە،ئیسباتی عبادەتی ئینحساری بۆ پەروەردگار یانیٚ پەرستین تەنیا تایبەت بەخوایە و لەپاشان (یەکیٚک لە مصداقە کانی روناکی) چاکە کردن لەگەلْ دایک وباوک بە یان دەکا و دەلیٚ: هەرکاتیٚ یەکیٚ لەو دوانەیاهەر دوکیان لای ئیٚوە پیر وکەنەفت بون بەجۆریٚ کە نیازیان بەتۆ پەیا کرد لەهیچ جۆرە ریٚزو ئیحیترا میٚک دریغ مەکەن و کە

مترین بیٚ حورمەتیان پیٚ مەکەن، تەنانەت (ئوٚف) یش مەڵێن.
لە باری زانستی و عیلمیشەوەئایەتی (**وَقَضیٰ رَبُّکَ اَلاَّتَعْبُدُوا اِلاَّ اِیّاهُ ...**) واژەی اِمّاله **اِمّا یَبْلُغَنَّ** بە فەرمودەی **ئیمام فەخری رازی** لە تەفسیری کە بیردا مورەکەبە لە اِنِ‌ی شەر تیەو مای شەر تیە کە بوٚ تەئکیدبە دوای یەکدا هاتون، یا بە قسەی **هەندیٚ‌تر** مورەکەبە لە اِنِ‌شەر تیەومای زائیدە کە وجودی ما ئیجازە ئەدا واژەی شەرتیە بیٚتە سەرفیعلیٚ کە بە نونی تەئکید مونەکەد بوەو لە **باری عیلم و زانستی ئەصولی فیقهیشەوە لەبابەت مەنطوق و مەفهومەوە، فەحوە لخیتاب و مەنطوقە کەی حورمەت و حەرامبونی ئوٚف و تن ودە ربڕینی دڵتە نگیەلای باوک ودایک؛ مەفهومە موافیقە کەیشی حەرام بونی لیٚدان** و ئازار گەیاندنە بەو دوانە یا بە یەکیٚ لە باوک ودایک چونکا لەجیٚ ئوٚف و تن ودەربڕینی دڵتەنگی لای باوک و دایک حەرام بیٚ، ئازار و لیٚدانیان بەولاترەوە حەرامە.
لەپاشان خوا فەرمویەتی: **وَلاٰ تَنْهَرْهُما ـ وَ قُلْ لَهُما قولاً کریماً** بە قسەی خونجاو، گونجاو، لطیف و پیاوانە لەگەڵ ئەوان قسەبکە ونیهایەتی تواضُعْ... و باڵی ئیتاعەتِی خوٚت لەبەرانبەر باوک ودایکت دالەبەر محبت و لُطْفْ شوٚڕبکەوە **وَاخْفِضْ لَهُما جَناحَ الذُلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ**. منداڵ دبیٚ دوعایان بوٚ بکاوبڵیٚ: ئەی خودای لایەزال باوک و دایکم مَشْمُولِ رەحمەت و عَظَمَتِ خوٚتی یان قەرار بدە هەر وەکو ئەوان منیان بەمنداڵی پەروەردە کرد **(وَقُلْ رَبِّ ارْحَمْهُما کَمٰا رَبَّیانِی صَغیراً)** وردبونەوەو دِقَّتِ فوقُ‌العادە لەاِحترامی باوک ودایکدا لەراستی‌دا لەدوئایەتی رابوردودا هەندیٚ وردەکاری لەڕو بەرو بون لەگەڵ باوک و دایک بەوٚینەی مُوٚدەبانە و اِحترامی فوقُ‌العادە لەلایەن منداڵەوە سەبارەت بە باوک ودایک راگەیندراوە:
١ـ لەلایەکەوە ئامک دریٚژ کراوە بوٚپیری ئەوان کە لەو دەمەدا زیاتر نیازیان بە حِمایَت و مَحَبتْ و اِحترام هەیە کە دە فرمیٚ: (کەمترین قسەی کاڵ ونەکوڵیو لەبابەت ئەوانەوە مەڵیٚ **(وَلاٰ تَقُلْ لَهُما اُفٍ وَلاٰ تَنْهَرْهُما)** نەگونجیٚ بگەنە حاڵیٚ کە نەتوانن بجوڵین یاهەستن یابگەرێن ئالیٚرە دایە کە لە ئەزمونی منداڵان سەبارەت بەباوک ودایکیان دیٚتە گوٚرکە ئایا باوک ودایکیٚ کەواکە و تبیٚ ئایاهوٚی رەحمەتە یا بەلاٚو مصیبت و ئازارە ئایا صَبْرو حَوْصلەی کافی یان بوٚ راگرتنی اِحترامی باوک ودایکیان بوٚهەیە یا هەر لحظە

وكاوێک زمان پیسی وقسەی کاڵ و نەکوڵیو وهەرزانە دڵیان دەکوڵن و ئازاریان ئەدەن.

٢ـلە لایەکی دیکەوە قورئان دەفەرمێ: (لە لای باوک و دایکت تەنانەت (حرامە بڵێی ئۆف جا مەڵێ ئۆف ئەمە لە لِحاظی اصولی فِقْهْ فَحَوی الْخِطاب وَمنْطُوقی پێ دەڵێن یانی: دەردی دڵتان لای باب ودایک دەرمەبڕن. وئیظهاری تەنەفور مەکەن و بەدەنگی بەرز مەنەڕێنە بەسەریاندا و آزاریان مەدەن لە لِحاظ اصولی فِقْهْ ئەمەیش مفهومی موافقی آیە تەکەیەکە طِبق ئەوە ئازاردانیان بطریقی اولی حەرامە و قاڵمە قاڵ مەکەن، بەڵکو کە ریمانە و پیاوانە و دڵ لاوێنانە لەگەڵ باب ودایکتان قسەبکەن ولە وپەری ئەدەب وحەیا و بەشەرمەوە بیان دوێنن کە زمان کلیلی دڵە.

٣ـلەلایەکی دیکەوە خودا فەرمان ئەدا کە منداڵ دەبێ بە تواضعەوە لەگەڵ باب ودایک هەستێ و دانیشێ چون محبت لەئەدەب و تواضعەوە سەر چاوە دەگرێ.

٤ـسەرئەنجام خودا دەستور دەداکاتێ رو دەکەیتە بارەگای خودا باوک ودایکت چ لەحیات وچ لەمەماتدا لە بیرمەبەوە وداوای رەحمەت و بەرەکەتی خود ایان بۆ بکە و بڵێ: خوداياهەر بە و جۆرەی کەئەوان منیان بە منداڵی پەروەردە کرد و رەحمەتیان لەگەڵ مندا کرد تۆیش رەحمە تیان لەگەڵدا بکە و بیان بەخشە.یەعنی هەروەکو تۆ ئەی منداڵ لەکاتی منداڵیدا نیازت بە چاو دێری باب ودایک بوئە وانیش یەعنی باب ودایکت ئێستا لەم هەل ومەرجی پیری یەدا نیازیان بە تۆهەیە تۆیش ئەبێ مەحەبەتیان لەگەڵدا بکەی و درێغ نەکەی وچاکەی ئەوان جوبران بکەیتەوە.

لەوشوێنەی کە دەگونجێ لەرابطە لەگەڵ حِفظی حقوق باب ودایک و إحترامی ئەوان و تواضعێ کە لەسەر منداڵ لازمە کە سەبارەت بە باب ودایکی ئەنجامی بدا لەو بابەتەوە هەڵخزێ و لاڕێ بێ کەئینسان ئاگادارانە یابێ ئاگایانە لادا و خودا نەخواستە توشی لاڕێ ببێ لەئاخرین باسی ئایە تەکەدا دەڵێ: (رَبُّكُمْ اَعْلَمُ بِمٰافِي نُفُوسِكُم) چونکا عیلمی خودا لەهەربارو بابە تێکەوە حضوری و ثابت و ئەبدی و خاڵی لەهەر جۆرە هەڵەوئیشتباهە کە چی عیلمی ئێمەی ئینسان دارای ئەم صیفاتانە نیە جائەگەربێ قصد طوغیان ومل بادان و خۆقەف کردن لەبەرانبەر فەرمانی خودا توشی لەغزشێ ببێ لەبابەت ئیحترام و چاکە کردنەوە سەبارەت بە باب ودایکی لەئێوە روبداوبلافاصیلە

پەشیمان ببیٚ تەوە بیەویٚ ئەوە جُبران و تولٚە بکاتەوە مُسَلَّماً ئەکەویتە بەر عـفوی خـودا هەروە کو خودا دەلٚیٚ: (ئەگەرچاک بن و توٚبە کار بن خودا توٚ بە کاران دەبە خشـیٚ «اِنْ تكُونُوا صٰالِحِينَ فَإنَّهُ كٰانَ لِلاْوّٰابِينَ غَفُوراً» ئەواب لەمادەی (اَوْبَ)ە ـ یەعنی گەرانـەوە لە روی ئیرادەوە لە حالٚیٚکدا (رجوع) بە مەعنای گەرانەوەی بە بیٚ ئیرادەیـە جـاهەر لە بـەر ئەمەیە (بە ـ توٚبە) دەلٚین اوبە چونکا حقیقتی توٚبە گەرانەوەیە لەگەلٚ ئیرادە کە بە ئـیرادە توٚبە بکاو بوٚلای خودا بگە ریٚتەوە جالە بەر ئەوەی (اَوابٌ) صیغە موبالەغەیە بەکەسیٚ دە و تریٚ کە هەر لحظە خەتایەکی لیٚ روبدا و بگەریٚتەوە لای خودا.ئەم ئیحتمالەش هەیە کە ذکری صیغەی موبالەغە ئیشارە بە تعدد عوامل گەرانەوەبیٚ بوٚلای خودا

١ـ بروابە پەروەردگار لەلایەکەوە.

٢ـ توجە بەدادگای عالە می قیامەت لە لایەکی دەکەوە.

٣ـ وجدانی بیٚدار لە باریٚ ترەوە.

٤ـ توجە بە عواقب و آثار گوناح لە لایەکی ترەوە دەس ئەدەن بەدەس یەکترەوەو انسان لە ریٚگای گوناحەوە لەخواو ئەخلاقی پاک و چاک دەگیریتەوە.

☐ لەچوار سورەی قورئاندا چاکـە کـردن لەگـەلٚ دایک و بـاب بلافـاصلە دوای مەسەلەی توحید قەراری گرتوە ئەمهاو رەدیف بونەی توحید وریٚز بوٚ باب ودایک دانانە ئەمەبەیان دەکا کە ئیسلام تاج رادەیەک بوٚ باب ودایک ریٚزی داناوەکە انسان دوای بروابە واحید بونی خوا ئەبیٚ ریٚزی دایک باوکی بگریٚ لاموایە ریٚز لە مە زیاتر متصور نیە.

لە سورەی بە قەرەئایەتی ٨٣دا فـەرمویەتی: (... لاٰ تَعْبُدُونَ اِلاّ اللّٰه وَ بِالْوٰالِدَيْنِ اِحْسٰاناً) و لە سورەی نساء ئایەتی ٣٦دا فەرمویەتی: وَاعْبُدُوا اللّٰهَ وَلاٰ تُشْرِكُوا بِـهِ شَيْئـاً وَبِالْوٰالِدَيْنِ اِحْسٰاناً) و لە سورەی اِنعام ئایەتی ١٥١ فـەرمویەتی: (اَلاّ تُشْرِكُوا بِـهِ شَيْئـاً و بِالْوٰالِدَيْنِ اِحْسٰاناً). ولەم ئایە تانەدا ئەم دوانەیان لەکەناری یەکداناوە (وَقَضىٰ رَبُّكَ اَنْ لاٰ تَعْبُدُوا اِلاّ اِيّٰاهُ وَبِالْوٰالِدَيْنِ اِحْسٰانًا).

☐ گرینگی ئەم باسە تا ئەو پلەیە کە هەم قورئان و هەم فەرمودەی پیٚغەمبەر بـە صەراحەت تە وصیە دەکەن: کە حتی ئەگەر باب ودایک کافریش بن رعایتی احترامایان لازمە لەسورەی لقمان ئایەتی ١٥ فەرمویەتی (وَاِنْ جٰاهَدٰاكَ عَلىٰ اَنْ تُشْرِكَ بِي مٰالَيْسَ

**لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلاٰ تُطِعْهُمٰا وَصٰاحِبْهُمٰا فِي الدُّنْيٰا مَعْرُوفاً)** یانیٚ: ئەگەر ئەوان ئیصراریان لەتۆ کرد کە موشریک بیٚ ئیتاعە تیان مەکە بە لاٚم لەژیانی دنیا بە چاکی و بەپیاوانە موعاشەرەتیان لەگەڵدا بکەن.

□ شوکر کردن لەحاند باب ودایکدا لەقورئاندا لە رەدیفی شوکردنی خودا لەراست نیعمەتەکانیدا راگیر دراوە، هەروەکو فەرمویەتی **(اَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوٰالِدَيْكَ** - سورەی لقمان ئایەی ١٤) باوەکو نیعمەتی خودا لەئەژمار نایێ ئەمە خۆیدە لیل و بەلگەیە بۆ عمق و پەرەداربونی حقوقی باب ودایک لەسەر ئەولاد.

□ قورئان تەنانەت کەمترین بیٚ اِحترامی لەحاند باب ودایک دا بەجایزنازانیٚ دیارە ئەگەر شتی کەمتر لە ئۆف و تن هەبوایی خودا نەهی لیٚ دەکرد.

□ باوەکو جیهاد یەکێکە لەگرینگ‌ترینی بەرنامەکانی ئیسلامی مادام کە جَنبەی وجوبی عەینی پەیدا نەکا یعنی داوتەڵەب بەئەندازەی کافی هەبیٚ؛ مانەوە لەخزمەت باب و دایکدا لەوە گرینگ‌ترەو ئەگەر موجبی نارەحتی ئەوان بیٚ جایز نیە، تەنانەت رازی بونی دایک لەیەک ساڵ جیهاد لەرێگای خوادا بەباشتر دانراوە بەلاٚم ئەگەر مەترسی یەک توشی ولاٚت و ئیسلام ببی حضور بۆجیهاد لازمە.

**سید قطب** لەتەفسیری **فی ظلال**دا حدیثێک بەم واتا: لەپێغەمبەرو کتێبی موعتەبەری حدیث نەقل دەکا کە پیاوێک خەریکی توافی کابەبوە ودایکی کردۆتە قەلاٚندۆش و توافی پیٚ کردوە و لەو حاڵەدا چاوی بەپێغەمبەر دەکەویٚ و عەرزی دەکا یا رسولَ اللّه (ص) حەق و ما فی دایکم بەجیٚ هێناوە، حەزرەتی رسولی ئەکرەم لە وەلاٚمدا فەرمویەتی (هێمان حەقی یەکیٚ لە ناڵەکانی ئەوت جُبْران نەکردۆتەوە، بە تایبەت ناڵەی کاتی حَمْل قسەلەم بابەتەوە زۆرە ناچارین هەڵی بگرین بۆ وتاریٚ دیکە، پێویستە لێرەئێشارە بە نوکتە یەک بکێن و بلێن: ئەگەر جارو بار باب و دایک پێشنیارگەلێکی غیرَ مَنْطِقی خِلافی شەرعْ بکەن و بیانەویٚ منداڵەکانیان بە رێگای ناشەرعیدا ببەن دیارە لێرەدا ئیتاعەتی منداڵ لەوان لازم نیە، بەلاٚم دەبیٚ بە شێوەی ئەمر بەچاکە و نەهی لەخراپە لەگەڵ ئەم جۆرە پێشنیارانە بەر خورد بکریٚ، حَضْرَتِ رەسول فەرمویەتی: بۆ رێز دانان لەباب ودایک ئە بیٚ بەبابەودایەهەرایان لیٚ بکریٚ نەک ناویان بەسادە ببەن و هەروا لەکۆرو

کۆمەڵدا بەرلەوان دا نەنیشێ و بەر لەوان بەرێگادا نەروا و کارێ نەکا خەڵکی قسەی سوک بەباوک ودایکی بڵێن، یەکێکی دیکە لەکلمەکانی ئەم ئایەتە قضایە و ... جانا جارێن : تە حقیقێ لەبابەت واتای واژەی قەضاوە بکەین.

قضالەمادەی قضاء لەئەصڵدا بەواتای جیاکردنەوەی شتێکە یا بەعَمَلْ یا بەقسە و هەندێکیش و تویانە: قضا بەواتای دوایی هێنانە بەشتێ. هەردو مەعنا لە واقع دا قریب‌الافوقن .

جا لەبەر ئەوەی دوایی هێنان بە شتێ وجیا کردنەوەی شتێ لەشتێکی دیکە مەعنایەکی وَسِیع و پەرەداری بۆ هەیەئەم واژە لەمەفاهیمی جیا جیادا بەکار دەبرێ.

**قُرْطُبِی ئەوزاناگەورە** لە تەفسیرەکەی خۆیدا شەش واتای بۆ ئەم واژەبەکار بردوە:

١- قَضَا بە واتای (ئەمروفەرمان دانە، هەروەکو **(وَقَضیٰ رَبُّکَ اَلاّ تَعْبُدُوا اِلاّ اِیّٰهُ.)**

٢- (قضا) بەمەعنای خەلقە، هەروەکو: **(فقضاهُنَّ سَبْعَ سماواتٍ فـي یَـوْمَیْن.** سورەی **فُصِّلَتْ** ئایەتی ١٣ خودا جیهانی بەوێنەی حەوت ئاسمان لەدو دەوراندا خەلق کردوە.

٣- قضا بەواتای حوکم و داوەری کردنەهەر وەکو **(فَاقْضِ مٰا اَنْتَ قٰاضٍ)** سورەی طە ئایەتی ٧٢: هەر جۆرە داوەرێک کەدەتەوێ بیکە.

۴- قضا بەواتای فەراغەتەلەکارو بارێک هەر وەکو **(قَضی الاَمْرُ الَّذي فِـیهِ تَسْتَفْتِیٰـانْ)** یوسف ئایەتی ۴١ = کارێک کە دەت ویست لەبارەی ئەوەوە (نەزەر خواهیت) دەکرد گەیشتە دوایی خۆیی و دوایی هات.

۵ـ قضا بەواتای ئیرادەو لێ نەوینە، هەروەکو **(اِذٰا قَضیٰ اَمْراً فَاِنَّمٰا یَقوْلُ لَهُ کَنْ فَـیَکوُنْ)** سورەی ئالی‌عمران ئایەتی ۴٧ یعنی: هەرکاتێ کە خودا بیەوێ کارێ ئەنجام بدا، خودا پێ دەڵێ بیەئەویش دێتەدیو و جود پەیا دەکا.

۶- قضا بەواتای عەهدو پەیمانە هەروەکو **(اَذٰا قَضَیْنٰا الی موسی الاْمْرَ)** سورەی قَصَصْ ئایەتی ۴۴ یەعنی کاتێ کە لەموسا پەیمان وعەهدمان وەرگرت، **تفسیری قورطوبی** جا۔ ۶ لاپەرەی ٣٨۵٣ هەندێکی دیکە لەموحەقیقان و زانایان و تەفسیر نوسان رایان گەیاندوە:

٧- قضا بەواتای هەواڵ دان **(اِخْبٰار)** وراگەیاندن و اِعْلامە، هەروەکو **(وَقَضَیْنٰا اَلیٰ بَـنِي اِسْرٰائِیلَ فِی‌الْکِتٰاب** ، یەعنی: ئێمە لەتەوراتدا بە بەنی ئیسرائیلمان راگەیاند و هەواڵمان

پی دان.

٨- قضا: بە واتای مەرگە، هەروەکو (**فَوَكَزَهُ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْه**) سورەی قَصَص ئایەتی ١٥ - یەعنی: موسیٰ مستە کوڵەیەکی لیٰدا و مراندی: ئەویش بەومستە مرد.)

تەنانەت‌هەندیٰ لە مُحَقِّقان و مُفَسِّران زیاتر لە سێزدە چاردە مەعنایان بۆ قضا، راگەیاندوە کە لە قورئانی مجید و لەم ئایەتەدایە، بە لاٚم ناتوانین ئەمانە بەمەعنای متعدد واژەی قَضَیٰ بزانین چونکا بۆ ئەوانە هەمویان جامعێک هەیە، کە لەوا جەمع دبنەوە ولەحەقیقەت‌دا زۆربەی ئەو مەعنایانەی کە رایان گەیاندون لەقبیل (اشْتِباه مِصداق بەمفهومَ) چونکا هەر یەکە لەوانە مِصداقێکە بۆئە و مەعناکوللیە و جامعَ یەعنی: دوایی هێنان وجیاکردنەوە.بۆوێنە قاضی وداوەر بەحوکمی خۆی بەدەعوا خاتمە بدا، ئافەریدگار بەئافەرینش خۆی بە خلقت شتیٰ دوایی دێنیٰ، هەوالٚ دەرێک بەهە والٚی خۆی بەبەیانی شتی دوایی دێنیٰ، تَعَهُّد کاری و فەرمان دەری بە تَعَهُّد و فەرمانی خۆی بەو مەسەلەیەدوایی بێنیٰ بە جۆرێکی‌واکە گەڕانەوە بۆ سەر ئەوە مومکین نەبیٰ. بە لاٚم واژەی قەضا لەهەندیٰ لەم مِصداقانەدا ئەونەبەکار براوە کە بەوێنەی مەعنایەکی تازە دەرهاتوە بۆ وێنە قضا بەمە عنای داوەری و بەمەعنای ئەمرو فەرمان - ە.

☐ تەحقیق لەبابەت مەعنی اُفٍّ بەواتای پیس و ئالودەیە بەناوی تەوهینیش بەکار دەبریٰ ئەم واژە بەناوی تەوهینیش بەکار دەبریٰ ئەم واژە تەنیا مەعنای ئیسمی بۆنیە بەڵکو فعلیشی لیٰ دروست کراوە، مەسەلەن دەڵێن: (**اَفَفْتُ بِكَذا**) یەعنی من ئەوشتەم بەئالودەداناو بەپیسم زانی وئیظهاری تە نەفورم کرد.

**خاوەنی تفسیری قرطبی** فەرمویەتی: **اُفٍّ و تُفٍّ**) بە واتای پیسی و چلکنی یە، کە لەژێر نینوک و ژێر قامک‌دا کو دەبێتەوە کە هەم پیسەو هەم هیچە، هەندێکیش لەنێوان (افٍّ و تفٍّ ) دا جیاوازی یان داناوە اُف بە واتای کێماوەی گوشتەو چلکی نینوکەولە پاشان پەرەی گرتوە و بەهەرشتیٰ کە هۆی نارەحەتی بیٰ افٍّ پیٰ دەڵێن. تەفسیری فەخر رازی جلد ٢٠ لاپەڕەی ١٨٨.

هەندیٰ ترو‌تویانە افٍّ بە واتای شتی کەم وکەم بایەخەوەکو تەپ وتۆز کە لەجلکی مرۆف بنیشیٰ کە بەفولێ کردن لای باوەنگیٰ کە لەو دەمەدا دێتە دەریٰ، شەبیهی اوف یا

آخ-ە لەپاشان لە ماناى نارەحەتى و تەنەفور لەشتێک بەکار براوە.

بە لاْم هەروەکو لەوجەمع بەندى يە دەرکەوت (افٍّ اِسمى صوْتە) کە لەکاتى دەردو ئۆف و ژان دا لە زار دێتەدەرێ لەپاشان ئەم (اسمە صوتە: افٍّ) بە وێنەى واژە دەرهاتوە و ئەفعاڵێکیشیان لێ دروست کردوە؛ تەواوى ئەو مەعنایانەى وا باسکران لەوەدەچێ لە مِصداقەکانیٖ ئەم واتا گشتى یەکە جامعى هەمویانە کۆ بو بیتەوە.

هەر جۆربێ ئەم ئایەتە شریفە لەعبارەتێکى کورتدا لەنهایەتى فەصاحەت و بلاغەتدا توانیویە تى ئەم واتاو مەعنایە بگەیێنێ: کە رێزو ئیحترامى باوک و دایک ئەونەزیادە کە تەنانەت نابێ لەحاند ئەواندا کەمترین قسەیەک کە بە ڵگە ى لەسەر نارەحەتى لەوان بێ مەیلى و تەنەفور بگەیێنى بەزاردا جارى بکرێ نەوە کو دڵى بێگە ردى ئەوان گەردى لێ بنیشێ -لە لحاظ اصول‌الفقە: **فَلاْ تَقُلّ لَهُمْا اُفٍّ مَنْطوقِ فحوى‌الخطاب** پێ دەلێن کە مَنطوقِ ئەوە حُرْمَتِ دڵتە نگیە، لە والدين و مفهومِ موافقِ ئەویش بطريقِ اَوْلى حُرمتِ لێدان و ئەزيت و آزارى والدين -ە.

***

## وَجَعَلْنا نَوْمَكُمْ سُبٰاتاً

# خەویا موعجیزەى قورئان لە ڕوانگاى زانستەوە:

خواى بەرزو بڵێند لەسورەى نەبەئدا ئیشارەو ئاماژە بە پە دیدەى (خەو) دەکاکە یەکێکە لە نیعمەتەکانى گەورەى خواکە بە مرۆڤى داوەکە فەرمویەتى: ئێمە: (خوا) (خەو) مان بە ئێوەداوە کە هۆى ئارامش و ئاراوقا راگرتنە بۆئێوە (**وَجَعَلْنا نَوْمَكُم سُبٰاتاً**) سبات لەریشەى (سبت) لە سەر وەزنى (وەختە) لەئەصڵدا بەواتاى (برِین) و قەتع کردن ولە دواییدا بەواتاى وچان؛ راگرتنى کارو کردەوە بۆ پشودان و بۆوچان دان بەکار براوە وەئەمە کە رۆژى شەمە لە لوغەتى عەرەبدا بە (یوم‌السبت) ناوبراوە لە بەر ئەوەیە کە ئەم

ناولێنانە لەبەرنامەی (جولەکە) وە سەری هەڵداوە کە رۆژی شەمەیان بە رۆژی (وچان و پشودان و راگرتنی کارو کردەوە داناوە.

تەعبیر بە (سُبات) ئیشارەیەکی جوان و ناسک و لەتیفە بە وچاندان وحەسانەوەی بەشگەلێکی، جێگای سەرنج لەبزوتن و تێکۆشانی لەش ولاری و رۆح وگیانی مرۆف لە حاڵی (خەو) و خەوتن)دا.

هەر ئەو وچان و پشودانە کاتی یە، خۆی ئەبێتە هۆی حەسانەوەو باز سازی ئەندامی ماندو و شەکەت و سواو و ئەبێتە هۆی تەقویەتی رۆح و گیان و لەش ولار وەتازە بونەوە و بوژانەوەی نیشاتی ئینسان وە لاچونی ماندویی و شەکەتی لەش و گیان وەسەرەنجام ئامادە بون بۆ دەس پێ کردنەوە بەکارو تێکوشان بۆ ژیان.

باوەکو یەک سێوەمی ژیانی مرۆف بە (خەو)رائەبرێ و مرۆف بێ خەوتن ناتوانێ بژی بەڵام هێمان رازو رەمزی (خەو یاخەوتن) بەچاکی نەناسراوە، تەنانەت ئەمەکە چ شتێک ئەێتە هۆی ئەمەکەلە دەم و چاغێکی تایبەت و دیاری کراودا بە شێ لە تێکۆشانی مە غزومێشک لەکار بکەوێ، وەمژوڵ و برژانگەکان بنیشنە سەریەک و هەمو ئەندا میلەش کش و مات بکەون، هیمان ئەمەبۆ کەس بەجوانی روناک نەبو تەوەو بۆ کەس بەباشی دەر نەکەوتوە!

بەڵام ئەمە، بۆهەمو کەس دیارە کە خەویاخەوتن نەخش و رۆلێ گەورەو گرینگی لەساغ و سلامەتی ئینساندا بۆهەیە جا هەر لەبەرئەمەپزیشکانی زانستی گیان ورەوان وە رەوانناسان تەلاش دەکەن و ئەکۆشن کە خەوی نەخۆشەکانی خۆیان بەوێنەی عادی تەنزیم و تەکوزی بکەن، چونکا بێ ئەوە تەعادولی رۆحی وگیانی یارەوانی ئەوەناگونجێ.

تاکە تاکێ کە بەوێنەی خۆرسک و تەبیعی خەویان لێ ناکەوێ و ناخەون تاکەتاکی تورە وکزو پەژارەدارو خەفەتباروتەوسەن و نارەحەت و مل بە خوس‌دا چون، بەراوەژوی کە سانێ کەخەوی باشیان هەیە لەکاتی بێداریدا نیشات و هێز وتووانایێ باش لەخۆیاندا هەست دەکەن.

کتێب خۆیندنەوە دوای خەوێکی ئارام بەخش زۆر بەلەز دەچێتە پێش‌و کاری فیکری و جیسمی دوای خەوتنێکی ئاوەها هەمیشە هۆی سەرکەوتنە، هەمو ئەمانە رۆڵ

ونەخشی گرینگ و گەورەی خەوتن بەیان دەکەن و بەمرۆفی نیشان ئەدەن.

هیچ شکەنجەیەک بەئەندازەی بێ خەوی کە بەزۆر بەسەرمرۆفدا داسەپێندرێ دەرداوی و رەنج هێنەرنیە ئەزمون نیشانی داوە کە مرۆف لە راست خەو دا خۆی پێ راناگیرێ وەدوای ماوەیەک بێ خەوی ساغ و سلامەتی خۆی لەکێس ئەچێ.

دیارە ئەوەی لەبابەت خەوتنەوە و تراوەمەبەست خەوی موتەعاد پڕ وشیاو و موناسبە ئەناپر خەویش هەروەکو زۆر خۆری خراپەو ئەبێتەهۆی نەخۆشی جۆر بەجۆر و زیاناوی.

سەیرو سەمەر لەمەدایە کەخەوتن بۆئینسان یەکسان و بەرانبەر نیەو سنورێکی دیاری کراو بۆ خەوتن نیە جا هەر لەبەر ئەمە هەرکەس بە ئەزمون ئەندازەی نیازی خۆی بەخەوتن بە پێی تروقانەوەو ماندو بون و کارکردنی زۆر یاکەم بۆی دەردەکەوێ لەشەو ڕۆژدا ئەزانێ چەندە بخەوێ چاکە یانەخەوێ جاری واهەیەمرۆ سەرخەوێ بشکێنێ بەسیەتی سەیریش لەمەدایەکە لەکاتی گرفتاری و سەختی دا کە مرۆف ناچاربێ و نەتوانی لەکاتی خۆیدا بخەوێ موقاوەمەتی ئینسان لەراست بێ خەویدا زیاد ئەبێ و مرۆف خۆراگر ئەبێ و خەوی مرۆف ئەزرێ بەسیەتی زۆرجاریش بینراوە کە لەکاتی عادیداکەگیروگرفت‌نەماکەمبودی خەو تۆڵە دەکرێتەوە ولەش‌ولار و ڕۆح وگیانی مرۆف تۆڵەی خۆی لەکەم خەوتن ئەکاتەوەو ئەچێتەوە سەر دۆخی جاران.

دیارە زۆر کەم بینراوە کە مرۆف بتوانێ چەن مانگ‌لە سەریەک بێداربێ و خەوی لێ نەکەوێ بەراوەژو هەن تاکە تاکێ کە تەنانەت لەکاتی رێ ڕوێشتن‌دا لەکولان یاشەقام تەنانەت لەکاتێکدا کە خەریکەلەگەڵ مرۆفدا داخوێ و قسەدەکا لە پڕ خەو ئەیباتەوەو ئەچێتە شیرین خەو.

بەکورتی بڵێین،ئاڵ وگۆڕێکی عەجیب کە خەو لە مرۆفدا بەدی دەینێ سەیرو سەمەرەیەکی زیادی هەیەکە لەموجیزە دەچێ.

ئەگەر چی ئەم ئایەتە ئەروانێتە خەو بەناوی یەک نیعمەتی ئیلاهی بە لام لەو جێگایەوە کە (خەوتن) لەمردن دەچێ و بێداری لەزیندو بونەوەی قیامەت دەچێ ئەشێ ئیشارە بەم مەبەستەش بێ.

لەپاشان لەپێوەندی لەگەڵ خەو قسە لەمەوهەبەتی شەویش کراوە کە ئەڵێ: (ئێمەشە ومان کردە پوشش ( **وَجَعَلْنَا الَّيْلَ لِبَاساً**).

دوا بەدوای ئەوە سەبارەتبە رۆژ ئەدوێ کە فەرمویەتی: (رۆژمان کردۆتە هۆی ژیان (بۆئێوە) **وَجَعَلْنَاالنَّهَارَ مَعَاشاً**- مَعاش ئەگونجێ ئیسمی زەمان یائیسمی مەکان و بەواتای زەمان یا مەکانی ژیان بێ یا (مَصْدَرِ میمی) بێ وشتێ قرتابێ و (سَبَبْنَا لِمَعَاشِكُم) بێ دیارە معاش لەمادەی عیشَ و بەواتای ژیانە لەگەڵ (حیاة) لەمەدا جیایەکە (حیات) بۆ خوا و پەریش بەکاردێ بە لاّم (عَیْش) هەربۆ ژیانی مرۆ و ئاژاڵە.

هەندێ کەس لایان وایە نورو روناکایی رۆژ نیعمەتەو زوڵمەت و تاریکی شەو شەڕ وعەزابە چون خۆیان قایل بە دوگانە پەرستین و بۆهەرکامەیان بەخوا یەک قایلن، رۆژو روناکایی لەیەزدانەوە دەزانن و شەو وتاریکیش لەئەهریمەنەوە. دیارە ئەم جۆرە بیرورایە دروست نیە بەکەمێ تێفکرین و بیرکردنەوە دەر دەکەوێ کەشەویا رۆژهەرکامە لە جێگای خۆیدا نیعمەتەو نیعمەتێکی گەورەشن و سەر چاوەن بۆنیعمەتی دیکەی خوایی.

بە پێ ئەو ئایەتانەی کەرامان گەیاندن پەردەی شەو جلک و پۆششە بۆ ئەندامی زەوی وبۆهەمو بونەوەرانی عەرز کە لەروی زەوی دەژین، تێکوشانی روژانەیان بەئیجبار رادەگرن خەریکی و چاندان و پشودان وحەسانەوە دەبن و تاریکی شەوکەهۆی کرو بێ دەنگی و ئاراو قارا گرتنە بەسەر هەموشتێکدا دەسەلاّت پەیا دەکا تا ئەندامە شەکەت و سوواوەکان پشویدەن و بێنەوە سەر خۆو بحەسێنەوە و رۆح و گیانی ماندو ماندویی خۆی دەریکا و تینێ نۆی لە لەش و لار بگەرێ و بێتەوە سەر دۆخی جاران و تین و تەوژم بگەرێتەوە گشت رەگ و شادەما رەکان چونکا خەوی ئارام تەنیا لەشەودا مەیسەر ئەبێ و بۆ مرۆڤ بەباشی بوز دەخوا.

تازەبەدا درانەوەی پەردەی رەشی شەو نوری رۆژ ئاوائەبێ و لەبەرچاو بزر دەبێ کەئەگەر هەروا بەردەوام روناکایی و نوری رۆژ بدرە وشتێوە و لەگۆ و لەکورەی خاکی جێگای ژیانی ئێمە بدرێ گژو گیاو ئاژاڵو بونەوەران هەمو دەسوتێن و تیا دەچن و زەوی هوی ژیان لەدەس ئەدا و ئیتر بۆ ژیان ناشێ.

جا هەر لەبەر ئەمەیە کەخوا لەقورئاندادوپاتە لەسەر ئەم مەبەستە دەکاتەوەو دەڵێ:
(قُلْ اَرَاَیْتُمْ اَنْ جَعَلَ النَّهارَ سَرْمَداً اِلیٰ یَوْمِ الْقِیامَةِ مَنِ اللّٰهُ یَأتِیکُمْ بِلَیْلٍ تَسْکُنُونَ فِیهِ) سورەی قصص ئایەی ٧٢. یانی بەمن بڵێین ئەگەر خوا رۆژ بکاتە هەمیشەیی بەسەر ئێوەدا وئەم رۆژ بو نە تا رۆژی قیامەت بەردەوام بێ (ونەبێتە شەو) چ کەسێ هەیە بێجگەلەزاتی پاکی خوا کەشەوی بۆئێوە داهێناوە تا لەودا ئاراو قارا بگرن و بحەسێنەوە ئەم جیی بەجێ بونەی شەوو رۆژەتان بۆسازیدا ئەبێ بزانین هەندێ لایان وایە (سرمد) لەئایەتەکەدا لە (سرد) کە بەواتای یەیتا پەیتایە، گیراوە و میم کەی زیادە، هەرچەن لەوە دەچێ واژەیەکی سەربەخۆبێ، هەندێکیش لایان وایە (سرمد) مەوجودێ کە نەسەرەتای بۆهەیە ونەپایان (ئەزەلی) مەوجودێ کە سەرەتای نەبێ (ئەبەدی) شتێ کە ئەنجام و پایانی نەبێ خوا، دوا بە دوای ئەوە هەر لەسورەی قەصەص ئایەتی ٧٣دا فەرمویەتی: (وَمِنْ رَحْمَتِهِ جَعَلَ لَکُمُ الَّیْلَ وَالنَّهارَ لِتَسْکُنُوا فِیهِ وَلِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ) یانی: لەرەحمەتی کە شەوو رۆژی بۆتان داناوە تا هەم لەودا ئارام بگرن و هەم لەخێرو بەرەکەتی خوا بۆ کارو تێکۆشان و بەدەس هێنانی پێ بژیوو ژیان ئەو پەری کەڵک وەربگرن.

## نەتیجە

بە لێ داوێنەی رەحمەتی خوا ئەونەپەرەدارە کە تەواوی کە رەستەو هۆی ژین و ژیانی ئێمەی داین کردوە تالەلایەک بیزوێن و کاروکۆشش بکەین کە ئەمەبێ روناکی رۆژ ناگونجێ، لەلایەکی ترەوە نیازمان بەحەسانەوە و وچان هەیە کەئەمیش بێ تاریکی شەو بۆزناخوا، ئەمرۆ لەروانگای زانستی و عیلمی یەوە سابت بوە کە لەبەرانبەر نورداهەمو دامو دەزگای بەدەنی ئینسان ئەکەویتە گەروکاو کردن و ئەبو ژینەوە: گەڕانی خوێن، دەزگای نەفەس کێشان، حەرەکەت و بزوتنی قەلب وەدام و دەزگاکانی تری لەش و لار ئەگەر نور زیاد لە ئەندازە بدرە وشتێوە سیلولەکان ماندوئەبن نیشات و شادی نامێنێ و ماندویی و شەکەتی و سوواویی جێگای دەگرێتەوە، بەراوەژو دام و دەزگای لەشلە تاریکی شەودا ئاراوقارادەگرێ و تەواو دەحەسێتەوە و هێزو تووانای تەنێز ژی تازە

بەدەس دەهێنێتەوە ئەمەیەک واقیعیەتی سەلێمندراوی عیلمیە، دیارە خەوشوێنی راستەو خۆی لەسەر زنجیرەی ئەعساب و شادەمارەکان و باقی ئەندامی ئینسان و بونەوەرانی تر داهەیە ئەمەیە موعجیزەی قورئان ئەوەیەکەخوا لە سورەی ئیسرا ئایەتی ١٢ فەرمویەتی: (**وَجَعَلْنا الَّيْلَ والنَّهارَ آيَتَيْنِ**): یانێ ئێمە (خوا) شەو و رۆژمان کردە دونیشانەی (تەوحیدو عەزەمەت) بۆخۆمان لەمەدا کەمەبەست لە (**آيَةَالَّيْلِ**) و (آيةالنهار) خودی شەو ورۆژە کەهەر یەکەلەو دوانە نیشانەیەکن لەپەروەردگار یامەبەست لە (آيةاليل) جرم و قورسی مانگەو (آيةالنهار) یش جرم و قورسی خۆرە؟ بە واتای یەکەم (اضافە) دە بێتە (اضافەی بيانيه) و بەواتای دوەم ئیزافەکە دبیتە (اضافەی اختصاصیه) و راست و دروستیش ئەوەیەکە بڵێین: هەرکام لەشەو رۆژ نیشانەن بۆ ئیسباتی و جودی خوا کە واتای یەکەمە هەرچەند تەفسیر نوسان بیرورایی جیاجیایان لەم بارەوە دەربوبوە.

یانەمە کەخوا فەرمویەتی (**وَمِنَ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ اَىْ صَلِّ فِي اللَّيْلِ بعدالاستيقاظِ نافِلَةً: فريضةً زائدةً خاصةً بك يا رسولَ اللهِ، عَسٰى اَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقامًا مَحْمُودا**)

ای : يحمدك كل الخلق (مقام) الشفاعة العظمى کەشەو بێداری تایبەتی ئەویندارانو عاشقانی خوایە کە لەتاریفی (متقين) دافەرمویەتی کە بەهەشتی خودا و نوێژی نافلەی شەوێ بە هۆی نێزیک بونەوە لە (مَقام محمود) و بەهۆی روناک بونەوەی چاو چاوی دڵ و دەرون دانرياوە (ئايەتی ١٧ سورەی الَم سجد) و متقين بەمەیش تاریف کراون (وبالاسحار هم يستغفرون - زاريات ئايەتی ١٨).

جێگای سەرنج و تێفکرینە لەقورئاندا بە زۆرێ لەشتە گرینگەکان جارێک سوێند خوراوە کەچی (حەوت ٧) جار بەشەو سوێند خوراوە ، دیارە سوێند بۆکار و باری گرینگ لەبەرچاو گیردراوە **ئەمە خۆی نیشانەی گرینگی پەردەی تاریکی شەوە کە خوا وابەو جۆرە ٧ جار سوێندی بەشەو خواردوە.**

هەربۆیی عارفانی رێبازی خودایش وا ئۆگری شەون تۆ بروانە ئەم شیعرە جوانەی هۆزان و خوناسی مەزن عەللامە حاج خەلیفە مەلامحەمەد:(بەها) کە لە غەزەلی بە ناو بانگی نیگاریدا فەرمویەتی:

شیعر:

وەیا هەوری رەشە بۆ رەنگەپۆشی ماهی روخسارت؟

شەوی دەیجورە یازوڵفەکە رۆژی روتی پۆشاوە؟

حاجی خەلیفە بەها لە ١٢٧١ لەدایک بودەو لە ١٣٥٣ی هەتاوی لە مەهاباد وەفاتی کردوەو لەلای شەهید شێخ مەحمودی نەهری لەنیزیک دەنگو رەنگی مەهاباد نێژاوە یا تو خوا جوان تەماشای ئەم غەزەلەجوانە عارفانەی ئیمامی سەید کامل شای زەنبیلی ناودار بە(ئاوات) بکەن کە فەرمویەتی:

(غەزەل - ی شەو)

**نوری روخسارت** وەدەرخە دەردی پێ دەرمانەشەر
زولمەتی زولفت لەسەر روتەلەرۆژ میوانەشەو
دوێ شوکرمەردانەرێم بردەناو زولفی رەشی
تابزانن خەڵکی مولکی دڵ: **قەلای مێردانەشەو**
هەرلەمە غەریب تا بەیانی، بێ و چان دیت و دەچێ
هەرلەدوی خورشیدی خاوەر وێڵ وسەرگەردانە شەو
کویرو نابینایە ئەولەداخی رۆژی روت
بویەرەش پۆش وفەقیرومات و بەستەزمانەشەو
قەدری شەو چابگرەچاوم شەمع و پەروانەدەڵێن
سۆزی گریەی شەمع هەرشە و سوتنی پەروانەشەو
عاشق و مەعشوق لەروژداخۆدە پارێزن لەخەڵک
گەریەنای چاکت دەوێ بونەودوە؟ بروانە شەو
هەستەکامیل بەسیە سستی دەی برو لیی راکەوە
تاولات بێ دەنگ و باسەو تالە رۆژ میوانە شەو.

ئەبێ بزانین ئەوانەی بەنوری دەسگرد (شەو) روناک رادەگرن و لەتەواوی شەو بێدارن و لە باتیان بە رۆژدا دەخەون مرۆفگەلێکی ناساغ و بێ نیشات و بێ شادین.

دیارە شەو سود و قانزاجێ تریشی لەکەناردا بۆ هەیە ئینسان زو لەسپێدەی بەرە بەیاناندا لەخەو راست ئەبێتەوەو رو دەکاتە قاپەی خوا و لەگەڵ مەعبودی خۆی دەست دەکا بەراز و نیازو خۆ دەخزێنێتە نێو پەرژینی ئیلاهی و دڵو دەرونی خۆ ی لەراست ئافەریدگاری خوێندا پاک و خاوێن و بێخەوش رادەگرێ و پاکی دەکاتەوە هەروەکوخوا

خۆی لەسورەی زاریات لەئایەتی ١٨ی قورئاندا فەرمویەتی: (وبالاسحار هم یستغفرون) ئەوانە (پیاوانی خوا) لەسپێدەی بەرەبەیاناندا لە پێشگای ئیلاهیدا، داوای لێ بوردن ولێخۆشیون لەخوا دەکەن دیارە خودایش ئاگای لەوانە.

وَمِنْ آیاتِهِ ... خەو:

**وَمِنْ آیٰاتِهِ مَنٰامُکُمْ بِاللیلِ وَالنَّهارِ وَ ابْتِغاؤُکُمْ مِنْ فَضْلِهِ اِنَّ فِي ذٰلِکَ لَاٰیٰاتٍ لِقَوْمٍ یَسْمَعُونْ** (ئایەتی ٢٣ سورەی روم).

نیشانەکانی عَظَمَتِی خودا لەناوەوە و لەدەرەوەدا یانی لەدەرون و خاریجی دەرونی مرۆفدا لەم ئایەتەدا لەسەرەتاوە خودا ئەبابەت پەیدا بونی (**خەو**) **بەناوی یەک پەدیدەی گرینگی**) ئافەرینش و نموداریٰ لەنِظامی حەکیمانەی خولقینەری ئەوە کە وتۆتە بەر وردبونەوە و لێکۆڵینە وەو فەرمویەتی: نیشانە و ئایاتی ئێوە بۆکەڵک وەرگرتن لەفە زیلەتی پەروەردگار ودابین کردنی نیازی ژیان **وَمِنْ آیٰاتِهِ منامُکُم باللیلِ والنهارِ وابتغاؤُکُمْ مِنْ فَضْلِهِ**)لەدوایی ئەم ئایەتەدا دەفەرمیٰ لەم ئومورەدا ئایات و نیشانەگەلی هەیە بۆئەوانەی گوێی بیستنیان هەیە و گوێیانْ ژەنەوایە **اِنَّ فِي ذٰلِکَ لَاٰیٰاتٍ لِقَوْمٍ یَسْمَعُونْ**).

ئەم حەقیقەت وراستی‌یە لەکەس نەپۆشراوە کەتەواوی مەوجوداتی زیندوی دنیا بۆ تجدیدِ هێزو قوا و بۆ بەدەس هێنانە وەی ئامادە بونی پێویست بۆ ئیدامەی کارکردن و تێکۆشان نیازی بەوچان وحەسانەوە وئیستراحەت کردن هەیە ئیستراحەتێ کە (بطور الزامی) دەگاتە سەرئینسان، تەنانەت ئینسانی پڕ تەلاش و کوششیش بۆ خەوتن و ئیستراحەت کردن ناچار دەکا.

چ هۆیەک بۆگەیشتن بەم مەبەست و ئامانجە چاکتر لەخەوتن تَصَّوُرْ دەکرێ کە اِلزاما دێتە سەرئینسان وئەو مەجبور دەکاکەهەمو تەلاش و کۆششی جسمانی ولەشی و بەشێکی گرینگ لە فعالیتەکانی فیکری و مەغزی ومێشکی خۆی تەعطیل بکا تەنیا **دەسگاگەلێ** لەجیسم ولەش وەکو قلب وریە و هەندێ لەفعالیتی مەغزی کە بۆ بەردەوام بونی ژیان لازمەکار دەکەن ئەویش زۆر ئارام ولەسەرخۆ.

## سەیرو سەمەرەکانی دنیای خەو.

بەو هەموو قسە و لێکۆڵینە وانەی کە زانایان لەبابەت (خەو) قسەیان کردوە، هێشتا زۆر رازو ئەسرارو حەقیقەتی ئەوە دەرنەخراوە.

لە نێو زاناییاندا قسەیە، کەچ فِعل و اِنفعالێک لە لەشی ئینسان دا جێ بەجێ دەبێ کە لەیەک چاولێک نانێکدا بەشێ لەفەعالیەتی مَغزْ و مێشک وەبەدەنی اِنسان تەعطیل ئەبی و تَحَوُّلێک لەسەر تانسەری رۆح و لەشی ئینسان زاهیر دەبێ؟

هەندێ هۆی ئەصڵی خەو (بەعاملی فیزیکی) دائەنێن و بروایان وایە کە خوێن لەمەغزە وە ئەچێتە شوێنەکانی دیکەی لەش و ئەبێتە هۆی خەوتن و بۆ ئیسباتی ئەقیدەی خۆی لەتەختو خەوی مَخصوصێ بەناوی (تختخوابی تەرازویی) کە ڵک وەر دەگرێ کە رویشتنی خوێن لە مەغزەوە بوئەندامەکانی تر دەردەخاو دیاری دەکا.

هەندێ دیکە هوێ خەو (بەعاملی شیمیایی) دا ئە نێن و بروایان وایە، لەکاتی کارو کۆیرە وە ریدا سمومێک لە بەدەنی ئینساندا پەیا ئەبێ کە بەشێ لە مێشک و مەغز لەکار دەخەن، لەنەتیژەدا اِنسان خەوی لێ دەکەوێ جاکاتێ ئەو سمومە جەزبی بەدەن بووتیاچو ئینسان بێدار ئەبێتەوە و لەخەو هەڵ دەستێ.

هەندێ دیکە لەزانایان رایان گەیاندوە کە هوێ خەو (عاملی عەصەبی یە) دەڵێن: سیستمی فەعالی عەصبی تایبەت لە مێشک و مەغزدا هەیە کە لەحوکمی گازی ئۆتۆمۆبیل دایەو لەبەر ماندوبون ئەکوژێتەوە و موەقەتەن لەکار دەکەوێ بە لاّم لەبابەت ئەم بیروڕایانە وە سوآلاتێ و نوختە گەلێکی مبهم و یا تاریکەلێ هێمان وەلاّمی ئەوانە بەروناکی نەدراونەتەوە وخەوهەروارازونهێنی خۆی شاردۆتەوە.

لەسەیرو سە مەرە بونی عەجباتی دنیای خەو ئەمەیە کەزانایان لەم دوایانەدا پەردەیان لە سەر لاداوە و دەڵێن: لەکاتی (خەو) دا هەندێ لەسیلولی مەغز کە بەناوی (سلولِ نیگاوان) ناوبراوە هەروا بێدارە دەمێنن و تەوصیەگەلێ کە ئینسان بەر لە خەوتن لەبابەت لَحظەی بێداری یەوە بەوانی ئەدا قەتلەبیر ناچنەوە تا لەکاتی پێویست تەواوی

مێشک و مەغز بێدار دەکەنەوە و دەیان بزوێنن.

بۆ وێنە دایکێکی ماندو بگرینە بەرچاو کە شەو دەخەوێ و منداڵە شیرە خۆرە کەی لەلاندک وبێشکە دالە نێزیک خۆیەتی ناخود ئاگا بەسلولی نیگاوان کە رابطِ نێوان رۆح و جسمە ئەمە ڕا- گەیێنی کە هەرزەمان منداڵە کەم نوزەی هات بێدارم بکەوە بەڵام زاڵە زاڵ و دەنگە دەنگی دیکە گرینگ‌نین جاومکنە شریخە شریخی هەورە بروسکە ئەودایکە بێدار نەکاتەوە بە لام بە... نوکەوکورکەی منداڵە کەی بەخەبەربێ ئەم ئەر کە گرینگە سلولی نیگاوان بە ئەستۆی گرتوە..!

خۆیشمان زۆر جار و ابوە کە بە یانان زو لەخەو هەستین - هەستاوین بە کورتی بێیین: خەر لەپەدیدەی رۆحە و روحیش جیهانێکە پڕوتەژی یەلەئەسرار ئەمەیەکە خودا ئیشارەبە خە و ئەکاکە دەلیلە لەسەر وجودی خودا.

خەوتن مۆهەبەتی گەورەی ئیلاهی یە کەخە و دەبێتە هۆ کەجسم و رۆحی اِنسان بە اِصطلاح سرویس بکرێن **وَمِنْ آیَاتِهِ مَنَامُکم باللیلِ والنهارِ وابتغاؤُکُمْ مِنْ فَضْلِهِ**، دیارە بەهاتنی خەو کە جۆرێ وەقفە و تەعطیلی کاری بەدەنە ئارامش و رەفعی ماندو بون حاصڵ دە بێ ئینسان ژیان و نیشاطێ تازە وهێزێکی دیکەی بۆ پەیا دەبێ.

دیارە ئەگەر خەو نەبوایێ رۆح ولەش- ی ئینسان زۆر زوسیس و سست و فەرسودە دەبووهەر زۆر زو پیری وتێشکان دەهاتنە سەر ئینسان جا هەر لەبەر ئەمە خەوی مرتناسیب و ئارام هۆی رازی سەلامەت و طولی عُمْرو دەوامی نیشاط و جوانی‌یە.

سەرەنج راکێشە قورئان اَوَّلاً خەوی بەر لە ڕستەی (ابتغاء فضل الله) داناوە کەئەم ئایەتە لەقورئاندا خۆی بەواتای تەلاشە بۆبە دەس هێنانی رزق و رۆزی ئەم پێش خستنە: ابتغاء فضل الله) موشکلێک دێنێتە پێش ئانیاً راستە کە خەو مَعْمولاً لەشەودایە و تەلاشی مەعاش لەرۆژدا ئەنجام ئەدرێ بەلام وانیە کە اِنسان نەتوانێ لەکاتی لزوم دائە م بەرنامە تغییر بداونە توانێ بیگۆڕێ و لەگەڵ زە رورە تەکان و نیازگەلی خۆی مونتەبقی بکا تعبیر بە **(منامُکم باللیلِ والنهارِ)** خەوی شە و ورۆژ ئیشارە بەو نوکتە دەکاکە: بێ بەرنامەی ئە صلی خەو مەربوط بەشەوە، شەو لەبەرئارامشێ کە لە تاریکی بەدی دێ‌و ئەولەوییەتێکی

تایبەت پەیا دەکا بەڵام جار جارە هەل و مەرجێ لەژیان بۆ ئینسان وئەنزان دێتە گۆرکە مەسەلەن بە شەو بچێتە سەفەرو بە رۆژا ئیستحراحەت بکاجا ئەگەر بەرنامەی تنظیمی خەو لەئیختیاری ئینساندا نەبوایێ چ موشکلێ دەهاتە پێش ؟

گرینگی ئەم مەبەستە بە تایبەت لە رۆژگاری ئێمەدا کە زۆرێ لەموئەسەساتی صەنعتی و پزیشکی و دەرمانی مَجبورن بَطوری موداوم لەتەواوی شەو و رۆژدا کار بکەن و تعطیلی بەرنامەی ئەوان مُمْکن نابێ، جاکار کەرەکان لەسێ نۆبەدا کار دەکەن، لەهەر زەمانێ تر بۆ ئێمە مەسەلەی گرینگی خەو روناک تردە بێتەوە.

نیازی جسم و روح -ی ئینسان بە خەو ئەونە زۆرە کە توانایی و وزەی ئینسان لەراست بێ خەویدا زۆر کەمە لە چەن شەو و رۆژ ناتوانێ تێ پەربێ جا هەر لەبەرئەمەبە رگری گرتن لەخەو هەمیشە بەناوی یەکێ لەدەردنا کترین شکەنجە لای جەباران و طا غوت وستەمکاران ناسراوە، هەروا یەکێ لەرێگای دەرمانی مونەسیری زۆرێ لەنەخۆشی یەکان ئەمەیە بۆ هەمو ئینسانێک دیاری بکا چونکا ئەمە پێوەندی بەسن و ساڵ و موقعیت اشخاص و چلونایەتی ساختمانی رۆحی و جسمانی ئەوانە وە هەیە ئەوەی گرینگە (خەوی کافی) مقدارێکە ئینسان دوای ئەوە احساس بکا کە لەم‌بابەتەوە تێر خەویا اِشباع بوە و نیازی بە خەو لاچوە هەر وەکوئا وخواردنەوە یا خۆراک خورادن کە إحساس بە تێری و تەسەلی بکا.

ئەمەش جێگای سەرنجە کە هەر وەکوئاو خواردنەوە یا خۆراک خواردن کە اِحساس بە تێری و تەسەلی‌بکائە بێ بۆخە ویش هە ست بە تە سە لی بکا.

ئەمەش جێگای سەرنجە کە هەر وەکو (طولی) زەمانی خەو لازمە عمق،ئەویش گرینگی یەکی تایبەتی بۆ هەیە چون ئەگونجێ یەک سەعات خەوی عمیق کاری چەن سەعات خەوی سەطحی لەباز سازی رۆح و جسمی ئینساندا ئەنجام بداو مرۆف لەخەو تەسەل بکا.

دیارە ئەگەر تەواو خەوی بۆ دەس نەدا نُعاس یا وەنەوزو خەوە نوچکە خۆی نیعمەتێکی ئیلاهی‌یە هەر وەکو لەئایەتی ١١ سورەی ئەنفال دالەبابەت مُجاهدینِ بَدْر لەوە یاد کراوە کە قورئان فەرمویەتی: (**إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ اَمَنَةً مِنْهُ**) چونکا لەمەیدانی

جەنگی (بدر) دا خەوی عمیق و تەواو مُمْکن نەبو.

دیارە نیعمەتی خەو وئارامش و ئاسایشیْ کە لەوە بەدەس دیْ وەهە روا هیْزو نشاط و شادی یەک کە دوای خەو پەیا ئەبیْ یە کیْکەلە نیعمەتەکانی خودا کەبەهیْچ بەیانیْک لەتەوصیف نایێ.

لەئایەتی ۲۴ رۆم دا دوای ئەو ئایەتەکە لەراستیدا پیْنجەمین بەشە لەئایاتیْ کە عَظَمتی خودا بەیان دەکا دەچیْتەوە سەر ئایاتی ئافاقی و مەسەلەی باران وهەورە بروسکەو بەرق وژیانەوەی زەوی دوایْ مردن ولەدەس دانی استعدادی شین کردنی گژو گیا، لەمانە دەکوڵیْتە وە ودەفەرمیْ (وَ مِنْ آياتِهِ يُرِيكُمُ البَرْقَ خَوْفاً وَطمعاً) ترس لەخەتەرەی ناشی لەبەرق کە جار جارە بەوێنەی هەورە تریشقە خۆنیشان ئەدا وئەی کاتە قەق نەس، و ئومیْد و هیوا لەروانگای بارینی باران کە ئەغلەب دوای رەعدو بەرق بەوێنەی رەگبارياگۆباڵ باران دیْتە خواریْ، جا کە وابیْ بەرقی ئاسمان پیْشەنگە، بۆبارینی باران سەرە رای فوائدی جۆر بەجۆری گرینگ، کە لەم بەرقەدا هەیە و عیلمی ئەمرۆ پەردەی لە سەر لاداوە ئەزانین کەدو قطعە هەور بە ئەلکتریستەکانی جیاجیاوە (یعنی مثبت و منفی) لیْک نیْزیک دەبنەوە پرشینگ و جەرقە ئەدەن ئەوانیش: (هەورەکانیش) شریخەی گەورە بەدی دیْنن کە بەناو (اِصطلاح) تخلیەی الکتریکی ئەبن.

هەرکاتیْ بەرەهوریْک کە دارای الکتریستەی مثبت، لە زەوی کە هەمیشە الکتریستەی منفی هەیەنیْزیک بیْتەوە شریقە شریق لەنیْوان هەورو ئەرزدا بەدی دیْکە (صاعقەی) پیْ دەلْیْن و مەترسی یە کەشی، لە مەدایە کەسەریْکی ئەوە ئەرزە و نقطە گەلْیْکی بەرزو مورتەفیعە، کە بە اِصطلاح نوکی، ئەم سیمە پیْک دینیْ، تەنانەت ئەگەر مرۆفیْک لە یەک بیاباندا ممکنە عملاً تبدیل بەنوکی ئەم سیمە منفی یە بیْ ودروست شریخە یەکی مە ترسیدار بەسەر ئەوئینسانەدا بیْ ولەچاولیْک نانیْکدا ببیْتە زوغال و قەقنەس جا هەر لە بە ر ئەمەیە لەکاتی رەعدوبەرقدا مرۆف‌دە بیْ لە بیابان خۆ بداتە بەر داریا دیوار یا کیْو و گاشە بەرد یا بچیْتە جیْگای بەزر یا لەگۆی کەندالْیْک خۆی وەشاریْ.

عیلمی رۆژسودو فوائد و بەرەکەتیْکی زۆری بۆ بەرق ئابت کردوە بەمجورە:

١ـ زەوی ئاودان، جاریوا هەیە بەرقی رەعد دو بەرق تا ١٥ هەزار دەرجەی

سانتیگراد گەرما تەولید دەکاو ئەم حەرارەتە کافی یە کە مقدار یکی زۆر لەهەوای دەو رو بەر، بسوتێنیٚ و لە نتیجەدا فەوری فشارو تەوژمی هەوا کەم دە کاتەوە، دیارە لە فشاری کەمدا هەور باران دە بارینیٚ، جاهەر لەبەر ئەمە ئەغلەب دوای جەهیشی بەرق گوپالٚ باران دەس پیٚ دەکاوهەروەکوگۆزەی سەرە و ژێر ئاو قلْب دە بێتە خوارێ، جالێرەوە دەرکەوت کە لەراستی دا بەرق یەکێکە لە ئەرک وئەسپاردەکانی ئاوەدانی زەوی و زار، ئەمە یەکێکە لە ئیعجازی قورئان و ئەم ئایەتانە کەخوا دەفەرمێ،(**هُوَالَّذِي يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفاً وَ طَمعَاً وَيُنْشِيءُ السَّحابَ الثِّقالَ ـ رە عد ئایەتی ۱۲**) یا ئایەتی ۲۴ سورەی روم کە فەرمویەتی و **مِنْ آياتِهِ يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفاً وَ طَمَعاً**) ئەبێ بلێم: ئێمەی موسولْمانان لە ولاٚت رە صەد خانەی مە راغامان سازدا کە لەروی فێرکردنەکانی قورئانەوە زانین بەخەلْک فێر بکەین، بەلاٚم چپکەین عیلم دەس بەدەس دەگەرێو دەچێتە نێو ئەوئینسانانەی کەزو تر هەولْی بەدەس هینانی زانین و عیلم ئەدەن.

۲ـ یەکێکی دیکە لەئەرکیٚ بەرق سەمپاشی یە، کاتێ بەرق بەوگەرما و حەرارەتەوە کە دەردە کەویٚ قەتەراتی باران لەگەلْ هەندێ ئۆکسیژینی ئیضافی تەرکیب ئەبیٚو لێک ئەدرێو ئاوی قورس یانیٚ: ئاوی ئۆکسیژینە ($H_2O_2$، هاش دو ئۆدو) بەدی دیـن دیـارە هەروە کو عیلم دەلْیٚ: ئاوی ئۆکسیژێنە یەکێک لە ئاسارەکەی کوشتنی میکرۆبە جاهەر لەبەر ئەمەیە لە (مصارفی طبی)دا بۆشوتنەوەی زام و برین بە کار دەبریٚ ئەم قطرە ئاوە ئۆکسیژێنە کاتیٚ دە بارێتەسەرزەوی، تۆبی ئافات و نەخۆشی گیایی لەنێو ئەبا و بەچاکی سە مپاشیان دەکا، جا هەر لەبەر ئەمەیە کەوتویانە: هەرسالْێک کە رعدوبەرق کـەم بـیٚ ئافەتی گیایی زۆرترە!

۳ـ یەکێکی دیکەلەئەرک و ئەسپاردەی بەرق تەغذیەوکود رەسانی یە، بەرق هەم خۆراک بە ئەرز ئەداو هەم کودی پیٚ دەگەینیٚ بەمحوٚرەقطراتی باران کەلە سوێنگەی بەرق و حەرارەتی توند تەرکیب و لێک دران لەگەلْ ئەوانە، جۆریٚ کودی پرسود و موئەسیری گیایی سازئەدا. وگژ و گیا و دارو دەوەن لەم رێگایەوە تەغذیە دەکرێن. هەندیٚ لەزانیان رایان گەیاندوە مقدار کودیٚ کە بە درێژایی سالْ لە (مجموعی بەرقی) ئـاسمانی بەوە لە کورەی ئەرزدا بەوجود دێ بەدەیان میلیون تۆنە! کەئەمەژمارە یەکی یەکجارزۆرە وزۆرلە

سەرەوەیەو زۆر بالایە جابیر بکەینەوە تا بزانین کە ئەم پەدیدە بە زاهیر کەم بایەخە و بێ خاصیە تەی تەبیعەت چەند پر بەر و پربەرە کەتە، هەم زەوی ئاو ئەداو هەم سەمپاشی دە کاو هەم خۆراک و هەم کودپێ ئە گەینێ، ئەمە وێنەیەکی چکۆلەیە لە ئە سراری عجیبٌ پەیداری جیهانی هەبون و عالەمی هەستی ،کەرێگا نشاندەرێکی زۆر روناکە بۆخوداناسی ئەمەیە (إعْجازِ) قورئان و ئایاتی سورەی رعد و سورەی روم کە نوکاتی ظریف و جوانی ئەوانمان بۆ ئیوە لە بابەت علمەوە دەرخست کە قورئان بەوە ناتیقە.

هەمو ئەمانە لەبەرەکەتی بەرقەوەیە، لە لایەکی دیکەیشەوە سوتان، ئاگر گرتن کە لە یەک جۆری ئەوە کە لە (صاعِقە) بەوجوددێ گاهێ ممکنە ئینسان یا ئینسانگەلێ یا دارو مەزرە عەیەک بسوتێنێ، هەر چەنە ئەمە کەمە و مرۆف ئەتوانێ خۆی لێ لادا بە لاّم دەتوانێ هۆی خۆف و ترس بێ، بەم جۆرە کە لەئایەتە کەدا هاتوە، بەرق هەم هۆی ترسە و هەم هۆی هیوا و ئومێدە کە ئایەتە کە ئیشارەی پێ کردوە و ئێمە بۆ ئێوەی ئازیز و بەرێزمان رون کردەوە و بە جوانی بەیانمان کرد.

لەپاشان خودا لەسورەی روم ئایەتی ۲۴دا ئەفەرمێ: **(و يُنَزِّلُ مِنَ السَّماءِ ماءاً فَيُحِي بِهِ الأَرضَ بَعْدَ مَوْتِها)** زەوی ویشک و سوتاو کە بۆی مەرگ لە تەواوی ئەوە دەبارێ، دوای نزولی باران بە جۆرێکی واگیان دەگرێ و زیندو دە بێتەوە ئاساری حەیات و ژیان بەوێنەی شین بونی گوڵ و گیا و چرودمرکردنی دارە کان لەوا خۆ دەنوێنێ، مرۆف سەرسام دەمێنێ لە عەزەمەتی کاری خودا.

لەدواییدا بو تەئکید دەفەرمێ **(إنَّ فِي ذالِكَ لَآياتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلونَ)** ئاقلاّن و خاوەن مێشک و بیران دەزانن کە لەم بەرنامەی ئافە رینشەدا وزە و دەستی قودرەتێ لە کاردا یەکە ئەوە رێنوێنی و ڕا بەری دەکا، قەت ناتوانێ (معلولِ تصادف) و زەرورەتی کوێر و کە ربێ و بێ خودا و بێ خالق بێ، دیارە خالقێ هەیە کە ئەم نظامەی وا جوان خەلق کردوە، بە زمانی حالێ پیمان دە لێ هەروە کو کتێبێکی پر ناوەروک یەک قصیدەی غەرا، یەک تابلۆی جوان و دلگیر، یەک ساختمانی (محکم و منظم) و پتەو و حیساب کریاو، بە زمانی حالّی خۆی لە علیم و زانست و مهارەت و زەوق وچەشەی نوسەرو قسە بێژ و (نەقاش و معمار) قسەدە کەن ئەمانەش ئیسباتی وجودی خودا دە کەن و پاکی و مُنَزَّهِی ذاتی ئەلاّ دە لێن **(وَإنْ مِنْ**

**شَیْءٍ اِلاّ یُسَبِّحُ بحمدِهِ و لکن لا تَفْقَهون تَسْبیحَهُمْ سورەی اِسـرا آیـەتی ٤٤)** هـەندی لەفەلاسیفە لایان وایە (تَمام ذرّاتی) ئەم جیهانە هەر یەکە بۆ خۆی نەوعیٚ ئـەقل و شـو عوریان هەیە و لە روی ئەو ئەقلْ و شـوعورە وە (تسبیح و تقدیس) خوا ئەکەن، نەک هەر بەزمانی حالْ و حکایەت کردنی وجودیان لە وجودی خۆدا، بە لْکو بە زمـانی حـالْیش (حمدْ و ستایش) خوا ئەکەن (شەپۆل).

# میعراج

سورەی ئیسرا - هەروەکو تەفسیری عەللامەئالوسی لە ج ١٥ لاپە رەی دودادەنوسیٚ: ئەم سورە بەناوی سُبْحٰانَ و ئیسرا و بەنی ئیسرائیل ناو دارە، دوناوی ئەوەڵ لەئایەی **سُبْحٰانَ الّذي اَسْرٰی** ... گیراوە و ناوی سێوە میش لەئایەتی ٣ **وَ آتَیْنٰا مُوسَی الْکِتٰاب و جَعَلْنٰاه هُدیً لِبَنِي إسْرٰائِیْلَ** گیراوە سورەی ئیسرا شەش هەزار و چوارسەت و شەست (٦٤٦٠) پیت و ٥٣٣) واژەیە و لەمەکە نازڵ بوە و بەبیسمیلاوە (١١٢) ئایە و دوانزە بەشە و موحتەواو ناوەرۆکەکەی بەمحوٚرەیە:

١- بە شی یەکەم - میعراجی پێغەمبەر (د.خ) **سُبْحٰانَ الّذي: اُنَزِهُ تَنْزِیهاً و تَعَجُّباً مِنْ قُدْرَتِهِ تِعٰالیٰ - اَسْریٰ بِعَبْدِهِ اَیْ جَعَلَ الْبُرٰاقَ یُسِیرُ بُالنَّبي (د.خ) لِنُرِیَهُ اَیْ لِنَرْفَعَهُ اِلیٰ السَّماءِ فَنُرِیَهُ مِنْ آیٰاتِنٰا اَیْ مٰا فِیهِ مِنَ الْعِبَرِ مِنْ عَجٰائِبِ الْخَلْقِ وِ مٰا فِیهِ مِنْ اَدِلَّةِ الْقُدْرَةِ الْبٰاهِرَة.**

٢- بە شی دوەم: قسە لە مەعاد - جەزاو سزادان و نامەی کردەوەو نەتیژەی ئەوە دەکا ئیمە نامەی کردەوەی هەرکەس ئەخەینە گەردنی خوٚی - ولە ڕوٚژی پەسلاٚندانامەی کردەوەی بوٚ دێنینە بە ڕچاوی تابە ئاواڵەیی بی بینیٚ.

٣- بە شی سێوەم قسەلە مێژوی تەژی لەگێرە و کێشەی بەنی ئیسرائیلە، کەلەسەرەتا و ئاخری ئەم سورەتەدا هاتوە و قسەکردن لەمافی دایک و باوک و ڕاگرتنی ڕێز، حەق ناسی لەهەر پایە یەکدا بە تایبەت لەبابەت خزم و کەس و کار و باوک .

٤- بەشی چوارەم قسە لە ئازادی ئیرادە و ئیختیار دەکاکە هەر جۆرەکار و کردەوە یەکی چاک و خراپی هەرکەس نەتیژەکەی بۆ خۆیەتی ولەمەنەدوێ کە ئایا بە ئافەرینشێکی نوێوە زیندو ئەکرێنەوە؟ ئەمە قسەی بێ باوەرانە، کەوا دواون و پرسیاریان کردوە.

٥- بەشی پێنجەم قسە لەمەسەلەی حیساب و کتێب لەژیانی ئەم دنیا دەکاکە وێنەیە بۆ دنیایێتر هەروا دەڵێ: بەندەکانم ئەبێ: لەگەڵ یەکتردا قسەی چاک و خۆش و باش بکەن.

٦- بە شی شەشەم قسە لەم ئایەتە دەکاکە دەڵێ: ئایا من بۆکە سێ سوژدە بە رم کە لە گڵ خەلق کراوە، ئەمە قسەی ئیبلیس بو، کە خوا بە پەری یەکانی فەرمو: بۆئادەم سوژدەبە رن، هەمو سوژدەیان برد بە لاُم ئیبلیس سوژدەی نەبرد و ملی بادا و هەروا لەبابەت وە سوەسەی شەیتان و وشیاردان بەبڕوادارانە، کەوریای گزی و فزی شەیتان بن ودەس لە بزۆزی هەڵگرن وگوناح نەکەن.

٧- بەشی حەوتەم لەم بەشدا قسە لەمانە دەکا: ئیسراف و تەبذیر، بەخیلی، منالْ کوشی، زینا، خواردنی ماڵی هەتیو، کەم فرۆشی، خۆبەزل زانی، خوێن رشتن، نوێژ کردن: (لەپینج کاتی سبەینان، نیوە ڕوان، عەصران، شیۆان و خەوتنان، وەخواناسی و خوابەیەک زانین.

٨- بەشی هەشتەم لەم بەشەدا قسە لەمانەدەکا: لە بابەت رۆح لەتۆپرسیار دەکەن، بڵێ رۆح بە ئەمری پەروەردگارە و ئێوە کە می‌لێدە زانن و هەروا لە بابەت بەرزی ئینسان بەسەر بونەوەرانی تروفەزیلەتی مرۆڤ، قسەدەکا.

٩- بە شی نۆیەم شوێن دانانی قورئان بۆ دەرمانی هەرجۆرە بیماری ئەخلاقی، کۆمەلاُیەتی و فێرکردنی خوی چاک و خودایی.

١٠- بەشی‌دەیەم‌ئیعجاز ی قورئان و نەگونجانی موقابەلە لەگەڵ قورئان.

١١- بەشی یازدەهەم خوا لەنێوان من و ئێوەدا شایەدە، خوا ئاگای لەهەمو هەست و خوستی بەرەی مرۆڤ هەیە.

١٢- لەم بەشەدا: سەرئەنجا می‌بەرزی و نزمی مێژوی بێغەمبەران بەناوی

دەرسی پەند وەرگرتن بۆ هەموئینسانێک و هەروا قسە لەمەدەکا کە خوا نۆ، نیشانەی روناکی بەموساداوە، کەدەفەرمێ: «وَلَقَدْ آتَيْنا مُوسىٰ تِسْعَ آيٰاتٍ بَيِّنٰاتٍ...»
بە مجۆرە:

١- گۆرانی عەصا بەماری گەورە (فَإذٰا هِيَ حَيَّةٌ تَسْعٰى طه ٢)

٢- یەدی بە یضاء (وٰاضْمُمْ يَدَكَ اِلٰى جَنٰاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضٰاءَ طه ٢٢)

٣- لەت بونی دەریا ( وُاِذٰا فَرَقْنا بِكُمُ الْبَحْرَ به قەرە - ٥٠)

٤- نزولی مەن: (گەزۆ) و سەلوا: (هەوێردە) ( وَاَنْزَلْنا عَلَيْكُمُ الْمَنَّ والسَّلْوٰى.بـە قەرە- ٥٧)

٥- هەڵقولێنی ئاو لەبەرد فَقُلْنَااضْرِبْ بِعَصٰاكَ الْحَجَرَ فَانْفَجَرَتْ مِنْهُ اِثْنَتٰا عَشْرَةَ عَيْناً، بەقەرە - ٦٠)

٦- جۆی بونەوەی هەندێ لەکێو و بونە سێبەر بەسەر یانەوە (وَاِذْ نَتَقْنَا الْـجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَاَنَّهُ ظُلَّةٌ ئەعراف - ١٧١)

٧- قات و قڕی و وشکە ساڵی و کەمی میوە (وَلَقَدْ اَخَذْنا آلَ فِرْعَوْنَ بِالسِّنِين وَ نَقْصٍ مِنَ الثَّمَرٰاتِ، ئەعراف - ١٣٠).

٨- گە رانەوەی ژیان بۆکوژ راۆیک کە هۆی جیاوازی بەنی ئیسرائیلی پێک هێنا بو (فَقُلْنَااضْرِبُوهُ بِبَعْضِهٰا كَذٰلِكَ يُحْيِي اللّٰهُ الْمَوْتىٰ . بەقەرە - ٧٣).

٩- کەڵک وەرگرتن لەسێبەری هەور لەگەرمای بیاباندا (وَظَلَّلْنـا عَـلَيْكُمُ الْغَمٰـامَ. بەقەرە - ٥٧).

هەروەکو رامان گەیاند لەبەشی یەکەمی ئەم سورە موبارەکەدا، لەبابەت میعراجی رەسولی ئەکرەمەوە، قسە دەکا کە بەشە و لەمە کەوە بردراوەتە مَسْجِدُالأَقْصَىٰ: (سُبْحٰانَ الَّذِي اَسْرٰى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنَ الْمَسْجِدِالاَقْصٰى ) ئەم بەشەو رۆیشتنە بۆ ئەوە بوە، لەلایەن خواوە، عەظەمەتی خوای نیشان بـدرێ (لِنُرِيَهُ مِنْ آيـاتِنٰا) خـوا زانـیویەتی حـەزرەتی محەمەد شیاوی پلەی بەرزی نبوەتە (اِنَّهُ هُوَالسَّميعُ الْبَصير) دیـاردی یـە، بـۆئەوە، لەم ئایەتەدا سەفەری شەوانەی پێغەمبەر زۆر وردوجوان بەیان کراوە.

١- رستەی (اَسْرَىٰ) نیشانەی ئەوەیە، بەشەو ئەم سەفەرەی پـێ کـراوە چـونکا

(اَسْرَىٰ) بە واتای سەفەری بە شەوە، بە لاَم سَیْرْ) بە واتای سەفەری بە رۆژانەیە.

٢- بێژەی (لَیْلاً) لەهەمان کاتدا کە دوپاتەیە بۆ ئەو واتایە ی کەلە (اسراء) دەردەکەوێ ئەم راستی یەش بەیان دەکا کە ئەم سەفەرە بە تەواوی بەشەوا ئەنجام دراوە، کە رێگای مسجدالحرام تا مسجدالاقصی کە زیاتر لە یەکە سەت فرسەخە، بە شە وێک حەزرەت چۆتە ئەوێ و گەرا وەتەوە.

٣- بێژەی (عَبْد) نیشانەی شانازی و بەرێزبونە، بۆ پێغەمبەر کەخوا گەیاندویەتە ئەو پلە و پایە.

٤- تەعبیر بە (عبد) نیشان ئەدا، ئەم بە شەو رۆیشتنە لە بێداریدا روی داوە ، سەیری جیسمانی بوە، نەک رۆحانی، چونکا بێژەی عَبْد نیشانەی ئەوەیە، کەلەش و گیانی پاکی پیغەمبەر لەم سەفەرەدا بەشدار بوە٠

٥- دەس پی کردن بەم سەفەرە سەرەتابوە، بۆ میعراج بە ئاسماندا، تا بچی لەنێزیکە وە نوری خوابینیۆ بەحەق ناسیاوبیۆ: ( **لَقَدْ رأىٰ مِنْ آیٰاتِ رَبِّهِ الْکُبْرٰی** – سورەی نەجم) .

٦- بێژەی (**سُبْحَانَهُ**) بە ڵگەیە بۆ پاک و بێخەوشی خوا.

٧- مِنْ لە ( **مِنْ آیٰاتِنٰا**) نیشان ئەدا، کە نیشانەی گەورەیی خوا ئەونە زورە کە پێغەمبەر بەوهەموە خۆشە ویستی یە کە لاێ خوا هەی بوە، تەنیا گۆشە یەک لە و نیشانانەی دیوە.

## میعراج لە روانگای قورئانەوە:

لەم ئایەتەدا (**سُبْحٰانَ الَّذِی اَسْرٰی بَعَبْدِهِ تا آخر...**) قسە لە سەفەری پێغەمبەر دەکا کە لە مسجدالحرامەوە، تا مسجدالاقصی (بیت‌المقدس) رۆیشتوە.

بە لاَم لە سورەی نەجم، بە شی دوەمی میعراج کە چونی پێغەمبەرە بۆ ئاسمان، بۆ حوزوری خوا بە جوانی بە یانی دەکا کە دەفەرمێ: (**وَلَقَدْ رٰاهُ نَزْلَةً اُخْرٰی. عِنْدَ سِدْرَةِالْمُنْتَهٰی . عِنْدَهٰا جَنَّةُالْمَاْوٰی . اِذْ یَغْشَی السِّدْرَةَمٰا یَغْشٰی، مٰا زٰاغَ الْبَصَرُ وَمٰا طَغٰی. لَقَدْ**

**رَأىٰ مِنْ آيٰاتِ رَبِّهِ الْكُبْرىٰ)** ئایەتی ١٣ تا ١٨ی سورەی نەجم . واتای ئەم ئایەتانە بە مجۆرەن: پێغەمبەر بۆ جاری دوەم پەری وەحی: جوبرەئیلی دی جاری ئەوەڵ لە غاری حیرا لەسەرەتای وەحی یەوە، دیداری دوەم لەنێزیکی بە هەشتی جاویدان بۆ پێغەمبەر، لەم دیدارەدا توشی هەڵەو خەتانبوە، دیویە نیشانەکانی گەورەیی خوای دی، ئەم ئایەتانە کە بە قسەی زۆر بەی موفەسێران قسە لە میعراج دەکا نیشانەی ئەوەن کە میعراج لە بێداریدا بوە **(مٰا زٰاغَ الْبَصَرُ وَ مٰا طَغىٰ)** چاوی پێغەمبەر هەڵە و خەتای نەکردوە.

## بیرورای هەندێ لەزانایان لەبابەت میعراجەوە

١- زانای ناودار **مەنصور عەلی ناصف**،کەلە زانایانی مەعاصرە و لەمامۆستایان و هۆزانفانانی ئەزهەری قاهیرەیە و نوسەری کتێبی ناوداری (التـاج)ە فەرمودە یەکی زۆری لەبابەت میعراجەوە، کۆ کردۆتەوە.

٢- **ئیمام فەخر رازی** لە بابەت شەرحی ئەو ئایەتانەی کە بۆ میعراجن، دوای بەڵگە هێنانەوەی ئەقڵی لە سەر میعراجی پێغەمبەری ئیسلام دەنوسێ: فەرمودە لەسەر میعراج زۆرن، کە لەکتێبی فەرمودە و صحاح دانوسراون و بەڵگەن بۆ میعراجی رەسولی ئەکرەم.

٣- شێخ عەبدولعەزیر، کوری **عەبدولاّ، کوری باز** سەرۆکی بحوث علیمیە و افتاو دەعوەت و ئیرشاد) کە لەسەر رێبازی وەهابی یە، لەکتێبی (التحذیر مِنَ البِدعِ) دەنوسێ: بی دودڵی ئیسرا و میعراج نیشانە گەلێکی گەورەن، کە لەسەر صِدق و راستی پێغەمبەری ئیسلام و بەرزی و مەزنی ئەوزاتە قسەدەکەن، تا ئەو شوێنەی کە دەڵێ: بە تەواتور، لە پێغەمبەرەوە نەقڵ کراوە، کە خوا ئەوی بردۆتە ئاسمان و درگای رەحمەتی خوێ بۆ حەزرەتی رەسولی ئەکرەم کردۆتە وە (تەحذیر لاپەرەی ٧) دوشەمە ٨ ذیحجە ساڵی ١٤١٢مانگیو ٦ژوئنی ١٩٩٢زو ١٣٧١/٣/١٨ هەتاوی لەحەج بۆنەهار لەگەڵ مهندس حساس میوانی بن باز بوم(شەپۆل)

## ئایامیعراج جیسمانی بوە یا رۆحانی؟

ئە وەی لەنا و مێژو نوسان و لێکۆڵەران و زانایانی دینیدا قاوە و دیانی پێدا نریاوە، ئەوەیە، کە میعراج لە بێداری دابوە، هەروەکو لەسەرەتای سورەی ئیسرا و لەئایەتی ١٣ تا

١٨ی سورەی نەجم‌دا، قسەی لی کراوە و لەبەرا رامان گەیاندوە.

## مەبەست لەمیعراج چبوە؟

مەبە ست لە میعراج و ئیسرا و شەو رەویی، ئەوە بوە کە گیان و رۆحی پاکی پێغەمبەری مەزنی ئیسلام (د.خ) بە دیتنی رازی عەظمەت و گەورە یی خیلقەت، خوای خۆی لەسەرانسەری، جیهانی بون، بەتایبە ت عالە می بالا کە کۆما و کۆزیلکە یەکە لە نیشانەکانی عە ظە مە تی خوای گەورە ببینێ و دوبارە و چە ند بارە دە رک و دیدورِوانگایەکی تازە بۆ هیدایە ت و رێنوێنی و را بە ری بە رە ی مرۆڤ بە دە س بێنێ. هە روەکو لە سە رەتای سورە ی ئیسرافە رمویەتی: (لِنُرِيَهُ مِنْ آيٰاتِنٰا...): تا بە رزی وینە نیشانەکانی خۆمانی نیشان بدەین و بەهێزو وزەو دەسەلأت و بێ وێنەیی خواناسیا و بێ و پەند وەربگرێ و رێگای راست بە خەلک نیشانبدا و لەرێگای خواناسیدا شارەزا و چاوساغی چاتی و خەلک بەرە و چاکە و چاکی و چاکبون بەرێ، بۆ سەرێ، جائەوەیە کە لە ئایەتی ١٨ سورەی نەجم‌د افە رمویەتی:

**(لَقَدْ رَأیٰ مِنْ آیٰاتِ رَبِّهِ الْکُبْرٰی)** یالەئایەتی ٢ بەم لاوە فەرمویەتی **(وَمٰا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوٰی. اِنْ هُوَ اِلاّ وَحْیٌ يوُحیٰ ، عَلَّمَهُ شَدیدُالْقُوٰی) ذُو مَرَّةٍ فَاسْتَوٰی. وَ هُوَ بِالْـاُفُقِ الْاَعْلٰی. ثُمَّ دَنٰا فَتَدَلّٰی فَکٰانَ قٰابَ قَوْسَيْنِ اَوْ اَدْنٰی، فَاَوْحٰی اِلیٰ عَبْدِهِ مٰا اَوْحٰی، مٰا کَذَبَ الْفُؤٰادُ مٰا رَأیٰ.**

میعراج و ئیسرا لەشەوی بیست و حەوت (٢٧)ی مانگی رەجەب روی داوە.و تەمەنی موبارەکی حەزرەتی رەسولی ئەکرەم(د ـ خ) پەنجا و یەک سال بوە. عارفی بە ناو بانگ حەکیم‌مەولانا عبدالرحیم مەولەوی کورد فەرمویەتی:

هۆنە

ظاهر اَسْرٰی بِعَبْدِهْ دەکات
میعراج بالَیقَطە و بالشخص اثبات
نەک بەخەو یا خیر بالروح فقط
ئەوە زەعمیکە بێ مەزە و سقط

چــــلۆن ئــەر بــەروح یــا مەنــام دەبــو
بـــاعث انکـــار بـــۆ عـــەوام دەبـــو
تــێهڵدە مَــذْهَبْ فــەلسەفەی خــداج
ایمـــان بـــیرانـــە بـــقصّەی مـــیعراج
جـــەوازی هـــەیە خـــەرق و ئیلتیـــام
چـــونکەتمـــاثل هـــەیە بـــۆ اَجْســـام
فــەلەک پــورِ مــەلەک سِــدرە غــەو غـابو
مٰــــا زاغَ الْــــبَصَرُ وَ مٰــــا طَــــغٰی بــــو
رێی چەندهەزارساڵ طەیچەندحیجـابات
ذات حـــەق کـــەلام سئوآل جـــەوابـــات
چـــو بـــو دی بـــیستی کریـــا دریـــاوە
هـــاتەوە حـــەڵقە هەردەلەریـــاوە
هەیتەلهەیتیکەی پێکەی هەی نەی خوی
وەک مـــاری زامـــدار هـــەر پێچدا لەخـۆی
لە پێشدا قسەمان لەئیسرا و میعراج کردچ لەروانگای قورئانی پیرۆزەوە وچ لەبابە
ت بیروڕای هەندێ لەزا نایانەوە، بیروڕای کەسانێ وەکو **ئیمام فەخر رازی مـەنصور عەلی ناصف** خاوەنی کتێبی تـاج کـە لەزانـایانی معـاصرە و لەهـۆزانفـانانی ئـەزهەری قاهیرەیە، بێشک ئیسرا و میعراج نیشانە گـەلێکی گـەورەن کـە لەسـەر صِـدق و راستی پیغەمبەری ئیسلام و بەرزی و مەزنی ئەوزاتە قسە دەکەن و بەتەواتور لەپێغەمبەر بیسراوە و نەقلَ کراوە کە خوائەو زاتەی بر دۆتە ئاسمان و درگای رەحمەتی خوێ بۆ حـەزرەتی رەسولی ئەکرەم کردۆتەوە و هەروا رامـان گەیـاند، مـەبەست و ئـامانج لەشـەوزەوی و مێعراج و ئیسرا، ئەوەیە کە خوا پێغەمبەری خۆی بگەینێتە شهودی باتنی و بەراز و نیازی نهێنی و ئـەسراری سرِسرِ و جیهـانی بـون نـاسیاوی بکـاولە هەمـان کـاتدا عـەزەمەتی خوایش لە نێزیکەوە، لەئاسمانە کاندا بە چاوی خوێ ببینێ، هەروەکو خوا لەئایەتی ١٨ سورەی نەجمدا رای گەیاندوە **(لقد رای من آیاتِ ربهِ‌الکبریٰ)** یا هـە روەکـو لەئـایەتی

یەکەمی ئیسرا و میعرا جدا لەسورەی ئیسرا دا، فەرمویەتی **(لنریه من آیاتنا...)** دیارە لە و ئیسرا و میعراجەدا، حەزرەتی رەسولی ئەکرەم بە مەبەست گەلێ زۆرتـرو گـرینگتریش ئاگادار کراوە، کە بە دریژایی تەمەنی موبارەکی، ئیلهام دەری ئەو زاتە بوە بۆ فیرکردن و بار هینانی بە رەی مرۆڤ.

جارجار بە زمانی کنایە و میسـال، بوئـاگـاداری ئـومەت لەدەرفـەتگەلی شیـاودا شەرحی داوە و راوەتی کردوە و بۆ خواناسی و بۆ خواناساندن بە خەلک، کە لکێ زۆری لەوە، وەرگرتوە و نـەتیژەی ئـەم مـیعراجـە ئـاسمانی یـە پـروتەژی‌یە، لە نـوکتەی وردی عیرفانی و خواناسی و فیرکردن و بار هینانی بە شەر.

میعراج و ئیسرا لە شەوی ٢٧ی مـانگی رەجـەب روی داوە و لەو سـەردە مـەدا تەمەنی حەزرەتی رۆسولی ئەکردەم ٥٢ سال بوەیانی، دوانزەسال بو کە وەحی بوهاتبو.

## ئیسرا و میعراج

خوێنە رانی ئازیرو بە ریز ئەبێ بروامان هە بێ کە ئیسرا و میعراج یەک واقعیەتی سەلمیندراوە و زانایانی ئیسلامی ئەوەیان بەدل وەرگرتوە، چونکا خوا هـەم لە سـوزەی ئیسرا و هەم لە سورەی نەجمدا شایەدی لەسەر میعراج داوە هەروەکو خوا فەرمویەتی **(سُبْحانَ الّذي اَسْرىٰ بِعَبِدِهِ لَيلا مِن الْمَسْجِدِ الْحَرامِ اِلي الْـمَسجدِ الاَقْـصىٰ)** ای: بـیت المقدس بێژە (اَسْرَىٰ بِعَبْدِهِ) نیشانەی ئەوەیە کە ئەم میعراجە لە بیداری، وە بـە گیـان و لەش‌بوە، یاهەروەکو خوا فەرمویەتی **(وَلَقدْ رَاٰهُ نَزْلَةً اُخْرىٰ** - کە نزلە بەواتای یەک جار نازل بونە، هەرچەند کـوری لە واژە زانـان و تـەفسیردانـان (نَـزْلَة) یـان بـەواتـای (مـرة) لیکداوەتەوە نَزْلَةً اُخرىٰ: بەواتای یەک جاری‌تر گرتوە و لەواتای نزول دایان رنیوە (عندَ سِدْرَةِ المُنتهىٰ) سدرە بە پێ‌لیکولینەوەی زانایان بەواتـای داری پـر بـەرگ و گـەلاٚ و پـر سێبەرە، بە لاٚم نەک‌لە شێوە و بیچمی‌داری زەوی، بە لکو سایە بانیکی گەورە، لە جیواری رەحمەتی حەقدا کەلە بەرزایی ئاسمانەوە، لەو پەری عُروجی پەری یەکان و ئەرواحـی شوهدا و زانستی ئەنبیا و کردەوەی ئینسانە کاندایە، جێگایێ کەپەری پەرودگار، ناتوانێ

لیی سەرکەوێ و جوبرە ئیلیش لەو میعراجەدا، کاتێ گەیشتە ئەوێ راوەستا هەرچەندلە قورئاندا لەبابەت (سِدْرَةُ الْمُنْتَهیٰ) دا تەوزیحێک نیە بە لاٚم بە پێ فەرمودە، ئەم تەعبیرە بەناوی یەک جۆر (تَشْبِیهْ) و کەم و کوری واژەی ئێمە مانانە، کە ناتوانێ، ئەو واتایە، جێ بکاتەوە (**عِنْدَهٰا جَنَّةُ الْمَاوَیٰ**) یانێ (**جنّة الخلد**)هەر وەکو خوا لە ئایەتی ١٩ سورەی سُجْدَەدا فەرمویەتی (**فلهم جنّت الماوی نُزُلَةً بِماٰ كاٰنُوا یَعْلَمُون**) دیارە بە قەرینەی ئایەتی دوای ئەمە، مەبەست بەهەشتی جاویدانە، بە لاٚم لەو شوێنەی کە خوا لە سورەی ئالی عمران ئایەتی ١٣٣ فەرمویەتی (**وَسارِعُوا اِلیٰ مَغْفِرةٍ مِن رَّبِكُم وَجَنَّةٍ عَرْضُهٰا الْسَّـمواتُ و وَالأَرْضِ) اَی اَسْبٰابُ الْمَغْفِرةِ مِن الْتَوْبَةِ وَ الْطٰاعَةِ، وَسِعَتِهٰا مِن حَیْثُ الْمسّرةُ، اَو اَنّ عَرْضَهٰا فی النَّشٰاَةِ الْاٰخِرةِ كَعَرْضِ الْسَموٰاتِ وَ الارضِ فی النَّشٰاَةِ الأُولیٰ. (اِذْیَغْشیٰ) السّدْرَة ماٰیَغْشیٰ)** یانێ لەودمەدا شتێک کە (**سَدْرَة الْمُنْتَهیٰ**) داپۆشی ودای گـرت (**ماٰزاغَ الْصَبَروَمـاطَغیٰ)** ئەمانە واقعیە تکن پێغەمبەر بە شهود دیبونی (**لَقَدْ رَایٰ مِن آیٰاتِ رَبِهِ الْكُبْریٰ**) هێندێ جنة المأوایان بە بە هەشتی جاویدان دانەناوەکە بـە ئـەندازەی هـەمو ئـاسمانەکـان و زەوی پەرەداربێ، جا لەبەر ئەمە جار جارەش جنةالمأوایان بە جێگا یەکی تایبەت داناوە کە لە کەناری (**سِدْرَةُالْمُنْتَهی**) دایەو ئەم واتایە لە زۆربەی ریوایاتی مێعراجـدا بەیـان کـراوە و راگیندراوە کە رەسولی ئەکرەم لەکاتی نزول لە میعراج لەکەناری (**سِدْرَةُالْمُنْتَهی**)نوری ئیلاهی و جبرەئیلی دیوە و لەو دیتنەشدا توشی هەڵە نەبوە و لە شهودی باتنی تردا «نَزْلَةً اُخْرٰی» لەکاتی میـعراج و ئیسرا دانوری خوای دیوە و نورەکە، تیشک و تیرێژی لە دڵ و دەرونی پێغەمبەر داوە و شهودێ بەتەواوەتی بۆئەو زاتە روی داوە، لە شوێنێکدا کە «**مُنْتَهٰا اِلَیْه‌قُربُ اِلی اللّٰه**» لەکەناری **سِدْرَةُالْمُنْتَهی کە جَنّةُالْمأوایش** لەوێ دایە لەحاڵیکدا کـە «**سِدْرَةُالْمُنْتَهی**» بە حیجاب و پەردەی نور داپوشرابو.

دیدەی دڵ و دەرونی پێغەمبەر لەم شهودەدا تەنیا لەحەق : (خوا) بو و هەر لەویش بو، کە نیشانەکانی عەزەمەتی **خوای لەئافاق و ئەنفوسیش**دا دی.

مە سەلەی شهودی باتنی: جورێ دەرک و دیدە، کە نە لە «ئیدراکاتی ئەقڵی دەچێ و نەبە ئیدراکاتی حِسّی، کە بـۆمرۆڤ لەرێگـای حـەواسـی زاهـرەوە دەرکـئەکـرێ کـە هەروەکو زاست و زانینی ئینسانبێ‌و بە وجودی خۆی و بیروباوەری خودی ئینسانبێ.

ئێمە بەوجودی خۆمان یەقینمان هەیە، بیرو باوەری خۆمان دەزانین کە چییە، لەئیرادە ولیٚ بران و ئارەزوی خۆمان ئاگادارین، دیارە ئەم ئاگاداری یە، نەلە ریگای بەلگە هێنانەوە و نە لە ریٚگای دیتنی زاهری یەوە، بۆمان پەیا بوە، بەلکو جۆریٚ شهودی باتنی یە، کە بۆمان پەیا بوە کە لەم ریگایەوە لەوجودی خۆمان و بەرۆحیەی خۆمان ئاگادارین، جاهەر لەبەر ئەمەیشە کە هەر زانست و زانیاری یەک کەبە شهودی باتنی بەدی بیٚ، هەلەی تیانابیٚ، چونکا نەلەرێگای بەلگەوەیە، کە هەلە، لە موقەدەماتەکەیدا پەیدابیٚو نەلەرێگای حیسەوەیە، کە هەلە، لە حەواسەوە بیٚ.

راستە کە ئێمە ناتوانین حەقیقەتی شهودیٚ کە پێغەمبەر لەو شەوە مێژوەی (ئیسرا و میعراجە) دا سەبارەت بەخوا پەیای کردوە، دەرکی بکەین، بەلام میسالیٚ کە هێنا مانەوە بۆنیٚزیک کردنەوەی ریگا، باش و شیاوە و ریوایاتی ئیسلامیش ریٚ نیشان دەرمانە.

**یەکەمین دیداری دۆست:**

خواناسان رایان گەیاندوە کە نجم لە «والنَّجْم» دا بەواتای زاتی پێغەمبەرە و (هَوَیٰ بە واتای نزولی پێغەمبەرە لەئاسمانەوە لەشەوی میعراجدا یا نزولی قورئان بو ناو ذل و دەرونی زاتی پێغەمبەر (**عَلَّمَهُ شَدیدُالقُوی - ذُومِرَّةٍ فاسْتَوٰی**) «مِرَّة» بە واتای کرژ و بادراو - ە - دیارە بەن هەرچی زیاتر بادریٚ و کرژ بکریٚ قایمتر دەبیٚ جا لیٚرەوە، بە واتای هیٚز و توانا و قایمی مادّی و مەعنوی بەکار براوە (**وَهُوَ بِالأُفُقِ الأَعْلیٰ - ثُمَّ دَنیٰ فَتَدَلّیٰ**) لە (تَدَلّیٰ) یە و بەواتای نیٚزیک بونەوەیە کە وابیٚ بۆ تەئکیدی واتای (دنیٰ) یە، یا هەردو بەیەک واتان و هەندیٚکیش لایان وایە (تَدَلّیٰ) بە واتای وابەستەگی و ئاویٚزان بونە، هەروەکو میوە کە بە دارەوە شۆر دەبیٚتەوە (**فَکٰانَ قٰابَ قَوْسَیْنِ اَوْ اَدْنیٰ فَاَوْحیٰ اَلیٰ عَبْدِهِ مٰا اَوْحیٰ - مٰاکَذَبَ الْفُؤٰادُ مٰا رَأیٰ - اَفَتُمٰارُونَهُ عَلیٰ مٰا یَرٰی**) «قاب» بە واتای ئەندازەیە و «قوس» بە واتای کەوانە، کەوابو «قابَ قَوْسَیْن» ئەندازەی دریٚژی دوکەوانە.

بیرورای مفسرانی ناودار، ئەمەیە کە موعەلیمی پێغەمبەر هەمان حوبرەئیلە، کە وەحی هێنەرو زۆر پرهێزبوە ئەوکە بەوێنەی (مرۆفی خۆشرو) خۆی بە پێغەمبەر

نیشان ئەدا و پەیامی خوای پی رادەگەیاند، **دوجار لەتەوا وی تەمەنی ئەوزاتە بە شکل و دیمەنی خۆی**، خۆی بە پێغەمبەر نیشان داوە- **جاری یەکەم لەئاسوی بـالآخۆی نیشان داوە** کە بە **(هو بالافق الاعلی)** ئاماژەی بـۆکـراوە (وتـەواوی خـۆر هـەلآت و خۆراوای دا پۆشی بوو ئەونە مەزن و پر عەزەمەتبو کە پێغەمبەر شلەژا و هەر ئەویش بو، لە پێغەمبەر نیزیک بوەوە کە ئەو نیزیک بونەوەیە بە (قاب‌قوسین) بەیان کراوە.

**جاری دوەم لەکاتی ئیسرا و میعراجی پێغەمبەر دا خۆی نیشانداوە**، هەندێ لە مفسران کەئەم بیروباوە رەیان دەربریوە، رایان گەیاندوە کە پێغەمبەر جاری یەکەم لەکە **ناری غاری** (حرا) لەکێوی نور جوبرەئیلی لە دیمەنی ئەصلیدا دیوە، ئەم تەفسیرە کە مەبەست لە **(شَدیدُالْقُویٰ)** جوبرەئیلە ئـە و باوەری کۆریٚ زۆرە، وەکو**(بیضاوی)** لەئـە نوارالتنزیل، زمە خشەری لە (کەشاف) دا و **قورتوبی لە الجامع‌لاحکام القرآن** دا و **ئیمام فەخر رازی** لە تەفسیری کە بیردا و سـەیدقوتب **لە** (فی‌ظلال القرآن) دا و مـستـەفا **مەراغی** لە تەفسیرەکەی خۆیاندا، ئەم باورەیان راگەیاندوە.

بەلآم ئەم جۆرە تەفسیرە کە (شدیدالقوی) یان بە جوبرەئیل **واتا کردوە بیٚ گریٚ نیە** چونکا:

١- لەئایەتی **(فاوحی الی عبده مااوحی)** ضەمیرەکان بە تایبەت ضەمیری «عبدە» بۆخوایە کەچی ئەگەر (شدیدالقوی) بـە واتـای (جـوبرەئیل) بـیٚ، هـەمو ضـەمیرەکـان دەگەرێنە وە لای ئەو، راستە کەنەتوانین بەقەرینەی خاریجی بزانین ئەمە، لەوانی ترجیایە، **بەلآم تێک چونی یەک دەسی ئایەتەکان و مەرجیعی ضەمیرەکان بەدژی زاهرە.**

٢- **شدیدالقوی تەنیا بوزاتی پاکی پەروەردگـارە**، راسـتـە کـەلە ئـایەتی ٢٠ سورەی (تەکویر) جوبرەئیل بە (ذی قُوَةٍ عِنْدَ ذی‌العرش مکین) یاد کراوە، بەلآم لەگەل «شدیدالقوی» کە واتایی پەرەدارتری هەیە، لەگەلٚ **«ذی قوّة» کە «قوه»** لەودا بە (مفرد و نکرە) بەکار براوە جیاوازی زۆرە.

٣- لەئـایەتی چـاردەدا کـە پـێغەمبەر ئـەوی لای (سـدرەالمنتهی) دی، ئـەگـەر **مەبەست جوبرەئیل بیٚ ئەو لەئـیٚسرا و مـیعراجدا لەسەرەتـا و لەزەویـدا لەگـەل پێغەمبەر بوە و تەنیا لەبان ئاسمانەکان ئەوی نەدیوە**، مەگەر بوتری لە سەرەتاوە ئەوی

بەوێنەی مرۆڤ دیوە و لەئاسمان بەوێنەی ئەصلی، لەحاڵێکا کە قەرینەیەک لەسەر ئەم مەبەستە لەئایەتەکاندا نیە.

٤- تەعبیر بە (عَلَّمَهُ) یا وێنەی ئەوە، لە قورئاندا بۆ جوبرەئیل بەکار نەبراوە، بەلاَم ئەوە لەبابەت خوا سەبارەت بە پیغەمبەری ئیسلام و پێغەمبەرانی دیکە زۆرە، بە واتایێتر جوبرەئیل موعەلیمی پێغەمبەر نەبوە، بەڵکو واسیتەی وەحی بوو موعەلیمەکەی تەنیا خودایە.

٥- راستە کە جوبرەئیل پەری یەکی خاوەن پلەیە، بەلاَم پێغەمبەری ئیسلام لەو بەرزترە، هەروەکو لە چریکەی ئیسرا و میعراجیشدا هاتوە، کە جوبرەئیل لەئیسرا و چونەسەریێ بۆ میعراج لەگەڵ پێغەمبەر دابو، جابە شوێنێک گەیی و لەرۆیشتن کەوت ووتی (ئەگەر بەئەندازەی سەرە قامکێک برومە سەرتر، باڵ و پەرم دەسوتێ) بە لاَم پێغەمبەر هەروا لەسەر ئیسرا و میعراجی خوێ بەردەوام بو.

٦- رستەی (ماكذب الفواد ما رای) دڵ و دەرونی پێغەمبەر ئەوەی دیویەتی خیلافی ئەوە نالێ بەڵگە لەسەر یەک شهودی باتنی‌یە، نەک دیتنی حیسی بەچاو، سەبارەت بە جوبرەئیل.

٧- کە وابێ مە بە ست لە م ئایە تانە ، شهودی باتنی تایبە تە سە بارە ت، بە زاتی ئەقدەسی خوا، کە بۆ پێغەمبەر لەم شوێنانەدا روی داوە و لەئیسرا و میعراجیشدا جاریتر دوپات بۆتەوە و حەزرەتی رەسولی ئەکرەم (د-خ) سەخت لەو جەز بەمەعنەوی یە، شوێنی وەرگرتوە.

٨- لەوە دەچێ بۆیی **زۆر بەی مفسّران رویان لەم واتا کردنە، وەرگێرابێ و رویان کردبێتە تەفسیری یەکەم لە بەر ئەمە،** بێ، کەئەم جۆرە واتا کردنە، بۆنی تجسم-ی خوا و هەبونی مەکان بۆ خوا بدا، کە چی خوا نەمەکانی بۆ هەیە و نەجیسمیشە (لَا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَ هُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ - ئەنعام ئایەتی ١٠٣) ئایەتی (ثُمَّ دَنَى فَتَدَلَّى) لە ئیسرا و میعراجدا، بۆ قوربی حەقانی یە.

## ئەبێ بزانین کە دیدی باتنی دو جۆرە:

١- دیدی ئەقلانی‌یە، کە لەرێگای بەڵگەوە، بەدەس دێ.

٢- پلەی شهودی قەلبی‌یە، کە دەرکێکە لەبان دەرکی ئەقڵەو دیدێکە، ما ورای دیدی

ئەوە، ئایەتی (**مازاغ البصر و ما طغی**) روزبهان بقلی شیرازیدەڵی: دڵ جێگای خودایە و دڵ بۆ خوا لە حوکمی عەرشی ئەکبەرە لەعالەمی خەلقدا (**قَلْبُ الْمُؤمِن عرشُ الرَّحْمٰانِ یٰا عرش اللّٰهِ تَعٰالی**).بڕوانە غایة الامکان فی درایة المکان نوسراوی تاج‌الدین مەحمودی شنۆیی لاپەڕەی ٢٦.

# میعراج و زانستی ڕۆژ:

لەڕابوردوا هەندێ لەفەلاسیفەلایان و ابو ئەو جۆرەی (بەطلەمیوس) و تـوێـەتی: ئەفلاک نۆیە و بەۆینەی پێستی پیوازە و ئەوە ما نیعێکی گرینگە بـۆ مـیعراج لەڕوانگـای زانستەوە، چونکا وجودی ئەم جۆرە ئەفلاکـەو لزومـی خـەرق: (لەتکـردن) و ئیلتیـام (پێکەوەلکان) کە بەهەڵە بڕوایان پیێبو، بە بەرهەڵستیان دائەنا بۆ میعراجو ئیسرای نەبیێ (د-خ).

بە لاٌم بەباتڵ بۆنەوەی هەیئەتی بـەتلەمیوس، مـەسەلەی خـەرق و ئیلتیـام لەبیر چۆتەوە و بەپێشەوە چونێ کە لەزانستی هـەیئەتی تـازەدا ڕویدا مـەبەست گـەلی نـۆی لەبابەت میعراجەوە هاتە گۆڕو پرسیار گەلێ تازەکەوتە بەرسەرنج دان بەمجۆرە:

١- بۆ چون بۆ فەزا لەبەرائەبێ بەسەر مانعی هێزی حاز بەی زەوی بەکەرەستەی زاستنی زاڵبین، چونکا بۆتێ پەربون لە (جەغزی جازبەی زەوی لانـی کـەم سـورعەتی چل‌هەزارکیلومیتر لەساتدا پێویستە.

٢- بەرهەڵستیێتر نەبونی هەوایە لەفەزای دەرەوەی جەوی زەویـدا کـە بـیێئەوە مرۆڤ ناتوانێ بژی.

٣- بەر هەڵستیێتر گەرمای سوتێنەری ڕۆژ و سەرمای کـوشەندەیە، کـەلەبەشێ لەڕۆژکە ڕاستە و خۆ نور ئەداتەوە یا نورناداتەوە وجودی هەیە.

٤- بەهەرستی چارەم ئەشیعە وترێژی بفەیەکە لەولاو لە ماوەرای جەودا هەیە، وەکو ئەشیعەی کەیهانی وە ئەشیعەی ئەولای بنەفش (وەنەوشە) و ئەشیعەی ئیکس، کە ئەگەر ئەم پەرتەو (تیرێژ) انە بە میقدارێ کەم لەلەش و لاری مرۆڤ بـدرێ، زیـانی بـۆ ئورگانیسمی بەدەنی ئەونیە بە لاٌم لە دەرەوەی جەوی زەوی ئەم تـیرێژانـە زۆر زیـادە و

کوشەندەیە، بە لاّم بۆ ئێمە دانیشتوانی زەوی وجودی توێژی هەوای جەو مانعی تابشی ئەوانەیە.

٥- کۆسپی بێ‌وەزنی، هەرچەندە مرۆڤ دەتوانێ بەرەبەرە خو بەبێ وەزنی بگرێ بە لاّم ئەگەر مرۆڤ هەروا بچێتە دەرەوەی جەو، حالّەتی بێ وەزنی بۆ بێتە پێش، زۆری بۆ سەختە یا بۆی بوز ناخوا.

٦- سەرئەنجام بەر هەڵستی لەهەموان سەخت‌تر ئەمەیە کە زانستی رۆژ دەڵێ سورعەتی بالاّتر لە سورعەتی رویشتنی نور وجودی نیە و ئەگەر کەسێ بیەوێ بەئاسمانەکاندا بگەرێ ئەبێ سورعەتێ زیاتر لەسورعەتی رۆیشتنی نوری هەبێ.

لەراست ئەو پرسیارانەدا سەرنج‌بدەنە چەن نوکتەکە بە ئیزنی خودا بە زویی بو ئێوەی عەزیر بەیانی دەکەین.

## شیعر:

شەو شەوی میعراجی شاهی ئەنبیابێ، وادەبێ
بیپەرستێ، بەڵکی سوجدەی بۆبباهەرئانەرۆژ

**ئەگەر پرسیار بکرێ؟ چونی حەزرەتی رەسولی ئەکرەم بۆ میعراج فایدە و قانزاجی چیەو حیکمەت و فەلسەفەی چبوە، کە ئەو ئیسرا و شەو رەوی یەی پێ** کراوە؟ وەلاّم ئەوەیە، کە رەسولی خودا کافران و دین دوژمنانی ئەدی کەلەم دنیا یەدا، لەناز و نیعمەت‌دان، بە لاّم بڕواداران لەدەرد و میحنە ت دان‌حە زرە ت جارجارە لە بە رئە و هۆیە پە ژارە دای ئەگرت و زۆری لەسەر گران بو، پەروەردگاری دلاّوا و دڵ لاوێن، ئەو زاتەی لاواندەوە و بردی‌یە، ئاسمان و میعراجی پێ کردو مەلەکوتی پێ‌نیشان‌دا و سەرەنجامی بڕوا داروبێ بڕوای بۆ دەرخست، کە بڕوادار جێی بەهەشتە و کافران جێگایان دۆژەهو دۆزەخە، ئیتر دڵ و دەرونی پیغەمبەری مەزنی ئیسلام ئارامی گرت، یەکێکی دیکە لەفەلسەفە و فایدەی میعراج ئەوەبو، تا رەسولی خوا بە چاوی عەیان نیشانەکانی عەزمەت و رەحمەتی خواسە بارەت بەئۆمەتی خۆی ببینێ، چونکا و تویانە: «لَيْسَ الْخَبَرُ كَالْمُعَايَنَةِ» چونکا هەرکاتێ لەبابەت بەهەشت و دۆزەخەوە پرسیاری، لێ

بکرایێ دەی فەرمو: دیم، نەک بفەرمێ: بیستم، ئەوە با شتر لەدڵ و دەروندا جێگا دەگرێ و چاکتر شوێن دائەنێ.

**یەکێکی دیکە لەفەلسەفە و فایدەی میعراج و ئیسرا بۆ ئەوە بوە تا شەرەف و عیزتی حەزرەتی رەسول بچێتە سەرێ و هێز و عەزەمەت و رەحمەتی خوا بـۆ خەڵک چاکتر بەیان بکا،** لەدنیایش عادەت وایە ئەگەر خاوەن هێز و دەسەڵات دارێک، بیەوێ یەکێ لە نێزیکانی خۆی بباتە سەرێ و سەربەرز و بـڵێندی بکـا، زیـاتر لەخـۆی نێزیکی دەکاتەوە و رازونیازی خۆی نیشان ئـەدا و ئـەی کـاتە مـەحرەمی رازی نـهێنی خۆی، خودایش کونوزی سەرای خۆی و رەحمەت و عەزەمەتی خۆی بـە پـیغەمبەری خۆشەویستی خۆی‌نیشان دا، هەروەکو فـەرموی: «**زُوِيَتْ لِيَ الْأَرْضُ فَأَرِيْتُ مَشَارِقَهَا وَ مَغَارِبَهَا**» چون گەنجینەی سەرای فەنای دی بردیانە عالەمی بەقا و نیشانەی رەحمەت و **عەزەمەتی، بەقایشی نیشاندرا، هەم سەرای رە حمەتی نیشاندرا، هە م سەرای خەشم و عەزاب، هەم گـەنجی فـەزڵ و داد و عـەدڵ، هـەم گـەنجینەی رەزا و بێرەزایـی،** پـێ حاڵی‌کرا، کەرەزای خوابێ عیللە تە، هە روەکو خەشم و غەزەبیشی بێ هۆوبێ دهۆیە، پێ حاڵێ کرا **رەزای خوا خۆی موافەقەتە، نەک موافـەقەت هـۆی‌رەزا،** هـەروا بۆیـان دەرخست کە خەشم و غەزەبی‌خوا، هۆی موخالەفەتە نەک موخالەفەت، هۆی خەشم و غەزەب، نیشـان دانـی ئەمـانە هـۆی مـەحەبەتی خـوا بـوە هـەروا کـە مـاڵی ئەمـانەت‌تا مەحەبەتی خوا روی نەکردە زاتی پێغەمبەر، نهێنی و رازی خیلقەت و عەزەمەتی خوای نیشان نەدرا تا ئەمانەتداری ئەوزاتە نەگەیشتە کە مال، رازو ئافەرینش و عەزەمەتی خوای پێ نیشان نەدرا.

ئـــەگـــەر پرسیـــار بکـــرێ؟ ئـــەی بـــۆچ لەسەرەتـــاوە ئەویـــان بـــردە بیت‌المقدس (**سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ.**) وەڵام ئـەوەیە کـە بیت‌المـقدس: (مسـجدالاقـصی) قـبلە و ڕوگـەی پـێغەمبەران بـو مەنـازیل و **نـــەزەرگە و هیجرەتگەی ئەوان بو،** خوا ویستی پێغەمبەری مـەزنی ئـیسلامیش ئـەوێ ببینێ و پیت و بەرەکەتی ئەنبیای پێ‌بگا و لەهیجرەت لە زەویداشان بەشانی ئەنبیا، بێ.

یەکێ تر لەفەلسەفەی میعراج ئەمەبو، تا ئەوەی لەو شەوە میعراجەدا، نیشانی درابو و بەعەیان دیبوی بگێڕێتەوە وئیقناعیان بکا، چونکا ئەوان بیتالمقدسیان دیبو، کاتێ نیشانەکانی ئەوییان، لێ دەپرسی و ئەویش وەلأمی ڕاست و دروستی ئەدا ناو مستیان بەناچار دەمیان دەبوە تەڵەی تەقیو یا بڕوایان پێدێنا، ئەمەخوێ یەکێ بو لەموعجزەکانی ئە و زاتە کە ئە و مە و دا دورە ی بە شە وێک بڕیبوونیشاکانی دیبو و گەڕا بوشەوە، بۆ مەکەی موعەزەمە بە پێ ئایەتی «فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ اَوْ اَدْنـى» حەزرەتی محەمەد ڕە سولولاّ (د.خ) گەیشتە ئەوپە ڕی قورب و مەنزیلەت، لای خوای گەورە و خاوەن عیزەت.

دەڵێن: فەلسەفەی ئەوەی بەشەو، بەحەزرەتی ڕە سول ئیسرا و شەو ڕەوی کراوە، ئەمەیە کە خوا ڕاز و نیازی شەوی پێدا، چونکا شەو سات وکاتی عارفان و خواناسانە و سەردە میخەڵوەتی دۆستانە، ئارامگەی موشتاقان و بێقەرا رانە، دەم و چاخی نوازشی بەندەگانە، کاتێ شەوداهات، کاتی خەڵوەتی دۆستان بەهات، دێ، ڕەقیبان لەخەودان و دژو دوژمنان و ئەغیاریش دورن، ماڵ چۆڵە و دۆست چاوەڕوانە:

شب هست و شراب هست و چاکر تنهاست

برخیز و بیا جانا کامشب شب ماست

## حەکیم عەلأمە مەولەوی کورد:

شەوەن، خەڵوەتەن، ماڵبێ ئەغیارەن

ئالەم گرد، وتەن، دۆس خەبەردارەن

شیخ ئەورەحمان:

ئیرادەم ئیدەن وەی کە لێو سەوە

شەو نالین وەشەن وەلای دۆسەوە

سەید کامل هاشمی زەبیل (ناوات):

دوێ شـــوکر مـــەردانەمن ڕێم بردەنـــاوزولفی رەشـــی

تـــابزانـــن خـــەڵکی مـولکیدڵ: **قـەڵای مێردانـەشەو**

قـــەدری شـەو چابگرە چاوم، شـەمع و پـەروانـە دەڵێـن

سۆز و گریەی شەمع، هـەرشـەو، **سـوتنی پـەروانـەشەو**

عـاشق و مـــەعشوق لە ڕۆژدا خـۆدە پـارێزن لە خـەڵک

گـەر پەنـای چـاکت دەوێ بـۆنەودوە؟ بـڕوانـە **شـەو**

عارفی ڕەببانی عەلامە **حاج خەلیفە مەلامحمد (بەها)** لەبابەت شەو فەرمویەتی:

وەیا هـەوری ڕەشـەبەو ڕەنگـە پـۆشی مـاهی ڕوخسـارت

**شەوی دەیجورە**، یازوڵفە کـە **ڕۆژی ڕوتـی پۆشـاوە؟!**

ئەوەیە کەلە فەرمودەدا هاتوە:

**(یـــا داودُ کَـــذِبَ مَـــن ادَّعـــا اِذا جَـــنَّهُ الَّـــیْلُ نـــامَ عَـــنّی)**

ئەی محمد (د.خ) هەرکەس لەرێگای ئێمەدا توشی، توشی بێ **توشی گەنج دێ**، پێمان ڕاگەیاندی « **وَمِنَ اللَّیْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ نَافِلَةً لَکَ** » بەشەو ڕا بە و نوێژبکە، بەشەو هەستە و لەگەڵ ئێمە: **(خوا)** ڕاز و نیازبکە، تا بزانی ئێمە ڕەنجی هیچکەس، زایەنـاکـەین و هـەرکەس دەگەیێ نینە سزا و نزای خۆی.

نوکتە: دەڵێن: خوا فەرمانی بە (آدم) دا برۆ خوارێ بە **لام بەرەسولی ئەکرەمی فەرمو:** بڕۆسەرێ و چۆڕێ ئاو پیاوانە و کەریمانە بپرژێنە بـەسەر ئـاخ و **خـاکـی دڵ و دەرونی ئومەتدا**، کە چاکان وایان وتوە:

**هۆنە**

شَرِبْنـــا وَاَهْرَقْنـــا عَـــلی الـــاَرْضِ قِسْـــطَهٰا

وَلِـــلْـــاَرضِ مِـــنْ كَـــأسِ الْكِـــرٰامِ نَـــصیبُ

هـــرکسی را جـــام او بـــا جـــان او همســـان کـــنید

هـــرکسی را نـــقل او بـــا عـــقل او مـــرهم نـــهید

یەکێ لەمەزنانی دینی فەرمویەتی: «لَمّا قَرُبَ الْحَبِيبُ غايَةَ التَّقْرِيبِ نالَتْهُ غايَةُ الْهَيْبَةِ فَالْطَفَهُ رَبُّهُ غايَةَ اللُّطْفِ لِاَنَّهُ لا تَحْمِلُ غايَةُ الْهَيْبَةِ الاّ بِغايَةِ اللُّطْفِ».

قال تعالی: « ثُمَّ دَنٰى فَتَدَلّٰى فَكٰانَ قابَ قَوْسَيْنِ اَوْ اَدْنٰى»

رازیست مرا با شب و رازیست عجب

شب داند و من دانم، من دانم و شب

میعراج لەروانگای دایرةالمعارفەوە:

میعراج لەبنەڕە تا بە واتای نەردەبان و پەیژەیە و لەقورئاندا لەسورەی ۸۱: تکویر دا لەئایەتی ۱۹ و ۲۰ و ۲۳ و هەروا لەسورەی (۵۳: نەجم) ئایەتی ۱ تا ۱۲ لەبابەت دیدارێکەوە لەرەوانە کراوێکی ئاسمانیەوە کە خۆی لە حەزرەتی محمەد (د.خ) ئاشکرا کردوە قسەدەکا.

لەم ئایەتانەدا لەمە بە ستێکی ئاسمانی قسە کراوە کەلە دورەوە بۆلای ئەودێ، بێ ئەوەی و ترابێ کە خۆی بەئاسماندا هەڵگەڕاوە.

ئەمەش ئایەتەکانی: «اِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ» ئەی: جبرئیل علیه‌السلام نَقْلاً عَنْ رَبِّهِ جَوٰابُ الْقَسَمِ. ذِي قُوَّةٍ عَنْدَ ذَى الْعَرْشِ مَكِينٍ: صٰاحِبِ قَدْرٍ وَ مَكٰانَةٍ رَفِيعَةٍ وَ شَرَفٍ ثَمَّ اَمِينْ: هُنٰاكَ - فِي الْمَلاٰءِ الْاَعْلىٰ - وَ لَقَدْ رَاٰهُ بِالاُفُقِ الْمُبِينْ: رَاٰهُ: اَىْ رَاٰى الَّرسُولُ جِبْرِيلَ بِصوُرَتِهِ الْخلقيّهِ وَ هو بَالاُفُقِ و له سورەی نەجمیشدا خوا فەرمویەتی: والنَّجْمِ: اَقْسَمُ بالنَّجْمْ: مٰا ضَلَّ صٰاحِبُكُمْ وَ مٰا غَوٰى: مٰا عَدَلَ الرسولُ عن الحَّق والهُدٰى جوابُ القسمِ وَ مٰاغوى: مَا اعْتَقَدَ بٰاطَلاً. و ما يَنْطِقُ ... بالقرآنِ عَنِ الهوىٰ» اَىْ عَنْ شَهْوَةٍ في نَفْسِهِ (اِنْ هُوَ) مٰاهُوَالْقُرْانُ اِلاّ وَحْيٌ يُوحىٰ - عَلَّمَهُ شَدِيدُالقوىٰ: وَ هُوَ اللهُ ذُوالْقُدْرَةِ الْمُطْلَقَةِ ذومِرَّةٍ فَاسْتَوٰى ذُومِرَّةٍ: صٰاحبُ قُوَّةٍ او خلقٍ حسنٍ او دقةٍ و حَصٰافَةٍ فَلاٰ يُخْطِئُ صيفەتی خوایە، واتا کەسێ بە حەزرەتی محمد (ص) فێردەکا کە زۆر پرهێز و جوان چاک و با لابەرز و تەرزە فاستوی:

ظَهَرَ لِجبْرِيلُ مُسْتَوِياً على صُورَتِهِ الحقيقيّةِ بَاجنحته التى تملا الافق - هو بالافق الاعى: افق اعلى: نێزیکی عەرشە. ثم دنا فتدلی - دنا: قرب جبريل مِنَ النَّبي - فَتَدَلّى: هَبَطَ مِنْ عُلُّو الى اَسْفَلْ (اى ان الدَنُوكٰانَ عَلىٰ جِهَةِ التَّدلّي مِنْ عُلْوٍ اِلىٰ سُفْلٍ - فَكٰانَ قابَ

**قَوْسَيْنِ اَوْ اَدْنیٰ** (قاب) مقدار – قوسين: **مسافةَ قوسَيْنَ اَو ذراعَيْنِ مِنْ النَّبی فَاَوْحٰی اِلیٰ عَبْدِهِ مٰا اَوْحیٰ ... الی عبدالله محمد(ص) مٰاکَذَبَ الفُوادُ مٰا رَاٰیٰ – اَفَتُٰارُوَنهُ علی مٰا یَریٰ – افتارون: هَلْ تُجٰادِلُونَهُ مُکَذِبِیْنَ وَ لَقَدْ راهُ نَزْلَةً اُخریٰ: مَّرةً اُخریٰ – عِنْدَ سِدْرَةِ المُنْتَهیٰ – سدرة شجرة من السّدر و هی شجرة نبقٍ عَنْ یَمِینِ العرشِ لایتجاوزها اُحدٌ مَنِ الملائکةِ والله اعلمُ بحقیقتها المنتهی: اَلّتي تَنْتَهِي عِندَهٰا علومُ الخَلاٰیقِ – عِنَدَهٰا جَنَّةُ الماْویٰ – اذ یَخْشی السدرة ما یَخْشی: یُغَطّیها وَ یَسْتُرُهٰا مٰا یُغطّیها مِن خلایقَ لایعلمُهـا الا الله – مـا زاغ البَصِرُ وَ مٰاطَغیٰ: مٰا مٰال بَصَرُهُ یَمِیْناً وَ لاٰ شمالاً عَمّٰا توجّه الیه و ما تجاوز ما شغل نفسه برؤیتِهِ – لقد رَایٰ (لیلةُ المعراج) من آیاتِ رَبِهِ الکُبْریٰ.**

نوکته: هەندێ لە قورئان زانان و تویانە لەم ئایەتی دَنیٰ فتدلّی دا پەس و پێشێک هەیە و بەم جۆرەیە: **«ثُم تَدَلیٰ فَدَنیٰ»** چونکا ئەصلی تدلی، نزولە، وەدنو نێزیکی یـە، ئەوەلْ نزولە ئەوسا نێزیکی، قاب **قوسین** لێرەدا بودویاتەی محەبەتە، وەئەو پەری رفعت و منزلت و قوربی شتێکە بەشتی **دیکە، نێزیکی** کەسی بەکـەسێ دیکـە (تـەفسیر ئیمـام **فەخری رازی** ج ١٨ لاپەرەی ٢٨٥ـ٨، کەشاف ج ٤ لاپەرەی ٣٨) (شەپۆل).

**میعراج لە روانگای عارفان و شاعیرانەوە:**

**ـ خاناخانی قوبادی ـ**

(لیـــلة المـــــعراج ئــــەو (قُــرّة العــین)
کــەرد بــە تــاج عــەرش مــوعەظـظەم نـەعلین
(خـــانا) بـــەسەرکەرد بـــەرز پـــایەش بـــۆ
بـــە فـــیدای رەوضـــەی فـــەلەک ســایەش بـــۆ

**ـ عەلامە نالی ـ**

لەقـــوربی (قـــابَ قـــوْسَیْنِ)ی دو ئــەبرۆت
مـــنی (اَدْنـــیٰ) چ دورو دەربـــەدەر مـــام

عارفی رەببانی شیخ **ئەحمەد** ناودار بەمەلای **جزیری**

برەمزا **قاب قەوسەینی** ژوان **بورهان** خەبەر دارین
(فَاتِ القَوْسَ بٰارِیَها اَلاٰ یٰارٰمِیَ القَوْسَیْن)

باریها: تاشەری کەوان، وەستا، کەوان تاش، کەوان ساز.

**ـ عەلامە مە لا کەریم زاری ـ**

**وصلی الله علی ئەو مەخزەنی ئەسراری مٰا اَوْحی**

**لەئیدراکی فیکری دانش ئەندێشان حەیرانە**

**وصلی الله علی ئەو بەدرە مٰازٰاغَ البصَرُ سورمەی**

**حەقیقەت بینی بۆئایاتی گەورەی حەییّ سوبحانە**

**ـ ناری شاسواری فەصاحەت و بەلاغەت:**

**شیعر:**

**ئایەتی میعراجی پایەی قاب قەوسەینت عەجەب**

**وەسفی ئیعزازت لەتەختی (اَو اَدنی)دەکا.**

**میرزای هەورامی:**

**یا پەنای ئوّمەت رەسولی سەروەر**

**بەرندەی نومرەی مٰازٰاغَ البصَرُ**

ـ دیوانی **حەمەی ئەحمەدبەگی** صاحیب قرآن ـ

**وەک گەردی بوراقت شەوی میعراجت بە جێما**

**جبریلی ئەمین نەبوئیتر قووەتی شەهپەر(باڵ شاپەڕ)**

ـ حەکیم و علامەی ناودار **ئەحمەدی خانی** ـ

**ئەی واسطەیێ وجودی کەونەین**

**شایستەیی قوربی قابی قەوسەین**

**شاهەنشەهی تەختگەه مەدینە**

**موعجیزتە ئەو قەدەر مەدینە**

**سەیرا فەلەکان لنک تە گافەک**

**فە خرا مەلەکان ژتە سلافەک**

**شەقەلقەمە را تە یەک ئیشارەت**

**زاغ البصرا تە یەک عبارەت**

ئـــەی پـــادشەهی ســـەریر لەولاک
را بـــە هـــەرە ئـــاسمانی چـــالاک
حـــازر ژتـــەرا بـــوراق و رەفـــرەف
شـــاترب تـــەرا فـــریشتە رەف رەف
دارەفـــع‌بین ژبـــەر، بـــەپەردە
بـــێ پـــەردە، دگـــەڵ خـــودی خـــەبەر دە

**ـ نیشتمان پە روە ر: حاجی قادری کۆیی:**

لە لای مەعاریجی تۆ تـەلغراف و بـەرق و شیهـاب
نەزیری زەوتـی تەنـاف بـازەفیکری تـەبعی عـەقیم
جودایی با سی مەکـەفەصلی (قـاب قـوسین)ت
کەمـانی ئـەبرۆیی تـۆ، لەبـەزمی خـاصی عـەلیم
خـەڵاتی عـیززەتی (لولاک و تـاجی (ارسلنـاک)
بـە سە ئەنـایی جـەلال و کەمـاڵ خولقی عـەظیم

**ـ عەلامە عبدالرحیم وەفایی:**

ئـەی شەهەنشـاهی سـەریری عـەرش ورۆحـانی غـولام
چـل‌چرای عـالەم فـەراز و شـانشینت مـاه و هـور
تـابی گـیسوت وەقـتی خـەندە تـابشی روت بـو،وتـم:
نەردەبـانی عەرشەپـایەی لامـەکـان مایەی حـصور
یـادی روی تـوّم کـرد وئـارامـی نـەهێشتم نـوری حـەق
ئـاوری تـێ بـەردام شوعـاعی رۆژ بـەتە قـریبی بـلور
دەنگـــی‌بێرەنگی‌صەدای‌هـات،زەنگ و دەنگـم پـێ‌نەما
بـاغی رۆح ئـەفزا دە پشکـوتن لەپـوشی و شک و زور
شـــانشینت‌عەرشی‌ئەعظەم،جـــیلوەگـــاهت خـــاک
مـەظهەری‌وەعدووەعیدت:صـەوتی‌ریضوان‌نـەفخی صـور

(شەپۆل) نوسەری ئەم باسە دەڵێ:

محەمەد بـا بـوراق و رەفـرەف چـوو ئـەوسا

(فدنـا مـنه ) پـێ ئـه نـدازی کـەوان و قـەوسا

نـوکته: لێکـوڵەرانـی بەناوبانگ، بـه تـایبەت مینۆرسکی و دوکتور موکوری نوسیویانه:

ئەهلی حەق یایارسان، **لەبابەت میعراجەوە** نه غمه و سرودێ زۆر جوان و سه رنج راکیشیان هـەیەلە (تـذکرهالعـلا) داو (راز ـ ی‌مـەگـو و سـەنگ ـ ی‌سیا) سـەفەری **مـیعراجـی** پێغەمبەری ئـەکـرەم بـەجۆرێکیوا بەخەیـاڵی عـەشق و ئـەوینی خۆیـان دەیرازیننەوە.

**میعراج** لەشانامەی حەقیقەتدا،که حاج نعمەاله جیحون ئابادی به شیعر دایناوه.

محمدهمـان رفت تـا پـای عـرش

در آنجـا کـه پـرده کشـیده بـفرش

دگـر جـبرئیل تـا بـهفتم سـما

بـدی رخـصتش مـاند آنجـا ز راه

ـ شێخی عەتار دەڵێ (فارسی) ـ

یک **بـراق** از نـور حـق آورده بـود

در میـان صـد هـزاران پـرده بـود

ـ مەولانا جەلالەدین رۆمی دەڵێ:

قـرب تـو پـایین بـه بـالا جسـتن است

قـرب حـق از حـبس هسـتی رسـتن است

نـیست را چەجـای بـالای است و زیـر

نـیست رانـی رود و نـه دور و نـه دیـر

کـارگاه صـنع حـق در نـیستی است

غـره هسـتی چـه دانـد نـیست چـیست؟

ـ شیخ سەعدی لەزمانی جبرەئیلە وەفەرمویەتی ـ

بگفتا فراتر مجالم نماند

بماندم، که نیروی بالم نماند

شاعیرێ تر کە دەرکی میعراج لە ئەقڵ و ئاوەزی بە شەر بە دەرئەزانێ فەرمویەتی:

عقل درین واقعه حاشا کند

عشق نه حاشا که تماشا کند

نوکتە: دەڵێن لەکاتی چونی حەزرەت بۆ ئاسمانی چوارەم چاوی بە دیقلێکی سپی جوان کەوتوە کە شاعر ناودار **حەکیم نظامی گەنجەوی** بە شیعر لەوبابەتەوە دەلی (اقبال نامەلاپەرەی ٢٩).

شنیدم که بر بالای این سبز فرش

خروسی سپید است در زیر عرش

چو او برزند طبل خود را دوال

خروسان دیگر کوبند بال

همانا که آن مرغ عرشی منم

که هر بامدادی نوایی زنم

برآواز من جمله مرغان شهر

برآرند بانگ: اینت گویای دهر!

**چریکەی کەڵە بابی سپی ئیشارە و ئاماژە بەمەیە کە یەک نەزم بەسەر جهاندا حاکمە و رێنوێنانی گەورەی ئاسمانی چ بێژن خەڵکی دیکەیش هەر ئەوەی دەڵێن و دوپاتی ئەکەنەوە.**

ـ عارفی ربانی **حکیم سنایی** لەحەدیقەدا:

گفت سبحانش الذی اسری

شده زآنجا به مقصد اقصی

شده از صخره‌اتا سوی رفرف

قاب قوسین لطف کرده به کف

ـ حەکیم نظامی گەنجەوی لەلیلی و مجنوندا ـ

ای نقش تو معراج معانی
معراج تو نقل آسمانی
برقی که براق بود نامش
رفق روشن تو کرد رامش
خرگاه بیرون زدی زکونین
در خیمه خاص قاب قوسین

شارە زوری:

حەزەتی مەولانا خالیدشارەزودی نوسخەی جامعە فەرمویەتی:

سرور عالم! منِ دلدادە حیرانِ توام
والە و سرگشتەی سودای هجران توام
شاە تختِ قاب قوسیّنِ تو منِ کمتر گدا
کی بُوَد یارای آن گویم کە میهمان توام
دیگران بهر طواف کعبە می‌آیند و من
کو بە کو افتادەی کوە و بیابان توام
دوش در خوابم نهادند افسر شاهی بە سر
گوئیا پای نهد بر فرق دربانی توام

ـ ـ هفت پیکر نظامی ـ

قاب قوسین او در آن اثنا
ازدنی رفت سوی او اَدْنی
شربت خاص خورد و خلعتِ خاص
یافت از قربِ حق براتِ خلاص

ـ ئەمیر خوسرەوی ذیلەویْ در مطلع الانوار ـ

شاە رسل خاست بدین اتفاق
برق صنعت جست بە پشت براق

حــرز کــله بســته زاَوْحـــی بــه ســر
چــتر ســیه کــرده از اَسْــری بــه ســر

از حــرم اول کــه. شــدند حــرام
بــرگذر قــبهٔ بــیت الحــرام

ـ سلمان ساوجی در جمشید و خورشید ـ

چــو احــمد از بـیت‌الحـرام احـمد سـفر کـرد
بــه ســوی مســجد الاقــصی گــذر کــرد

چــو تــیر غــمزه در یک طــرفة العــین
رســید از خــوابگــه تــاقاب قــوسین

ـ جامی در یوسف و زلیخا ـ

شــبی دیبــاجهٔ مــعراج صــبح سعــادت
ز دولت‌هــای روزافــزون زیــارت

ـ ـ وحشی بافقی ـ

بســوی مســجد اقــصی عنــان داد
تک و پــو بــا درخش آســمــان داد

## عه‌للامه شێخ مه‌عروف نودیی به‌رزنجی:

رَبّک اَسْــریٰ بکَ لیــلاً اِلی حــیثُ تــجلی لکَ رَبّ الْــبَشَر
روح‌الامین بـا تـو بـه سـدره رسید مــانده پَسِ پـرده تـوکردی گـذر.

ئه‌م وتاره‌له کۆواری به یان «تبیان» ژماره کانی ۶ و ۷ و ۸ ئورگانی ناوخۆیی ناوه‌ندی گه‌وره‌ی ئیسلامی غه‌ربی ولأت «ئێران ـ کوردستان» چاپی سالّی ۱۳۶۹ و ۱۳۷۰ی هه‌تاوی به‌قه‌لّه‌ی (شه‌پۆل) بلاّ وکراوته‌وه.

# پیرست

| مەبەست | لاپەرە |
|---|---|

## فیهرستی

کتابی باوی کۆمە لایەتی کەلەنەو رۆزی ٥٨ چاپ بوە و ئیستا بۆ جاری دورەم لە سروش لە ژێر چاپدایە

